# ئیبراهیم ئەمین باڵدار

## مامۆستای نەوەکان

ڕۆڤار
43
بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێک دەریدەکات







نیگاری: کاردۆخ

سەرپەرشتیاری گشتی
شێرکۆ بێکەس

راوێژکار
ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری رۆڤار
یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری
قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید

سەرپەرشتیاری چاپ
فەرهاد رەفیق

رۆڤار بڵاوکراوەیەکی رۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێک، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوومانگ جارێک دەریدەکات

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

لە دەرەوەی وڵات
Tel: 00441628477660
Fax: 00441628486008

Web Site
www.sardam.info

Email
Sardam@sardam.info

چاپخانەی رەنج





**کاردۆخی دارا**

لەدایکبوی ساڵی ١٩٨٣ لە شاری (رۆما) لە ئیتاڵیا.
دەرچوی پەیمانگای هونەرەجوانەکان، بەشی شێوەکاری (نیگارکێشان) بە پلەی یەکەم بەشداری چەند پێشانگایەکی هاوبەشی هونەرمەندانی کوردستان بۆ ئەنفال، هەڵەبجە)
بەشداری لە خولەکانی گەلەری زامۆا.
بەشداری لە خولی گەلەری دهۆک.
چەند پیشانگاو چالاکیەکی تر.
ئێستاش فێرخوازی دوا قۆناغی کۆلێژی هونەری سلێمانی.
پرۆژەی ئێستا (چەند تابلۆیەك بەشێوەی ریالیستی لەسەر شۆرشە کوردییەکان).

**ژمارەکانی رابردوو**

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری جەلال تەقی، حەمە سالح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵلا پەشێو، جگەر خوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی

# کورتەیەك لە ژیانی مامۆستا باڵدار

*ساڵی ١٩٢٠ (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) لە گەڕەکی سابوونکەرانی شاری سلێمانی لە دایك بوو.

*خوێندنی قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی (فەیسەڵیە) کە لە جێی بازاڕی (عەسری ئێستادا بوو) تەواو کردووە.

*ساڵی ١٩٣٩-١٩٤٠ لە بەغداد خوێندنی (دار المعلمین)ی ریفی تەواو کردووە.

*ساڵی ١٩٤٠ بوو بە مامۆستای دێی قەمچوغەو جاسەنەو لەوێوە خولیای دانانی (ئەلف و بێ) بۆ منداڵانی کورد کەوتە سەریەوە، بۆ خۆی لە ساڵی ١٩٤٨وەها ئەڵێ: (لەم دێیەدا هەلێکی باش بۆ نووسەر هەڵکەوت کە بتوانێت دەرسەکانی ئەو (ئەلف و بێ)یە دابنێت و، ڕۆژ بە ڕۆژ، بەسەر قوتابییەکانا تاقیان بکاتەوە).

*لە قوتابخانەکانی: تەوێڵە و هەڵەبجەو چوارتا و عبدالالە مامۆستایی کردووە.

*ساڵی ١٩٤٩ (ئەلف و بێ) یەکەی تەواو کرد و وەزارەتی مەعاریفی ئەو کات بڕیاری لە چاپدانی دا. لەم بارەیەوە ئەڵێ: (خەت خۆش بەناوبانگ (صبری الخطاط) کە هیچ کوردی نە ئەزانی، دوای ڕەنج و هیلاکی‌یەکی زۆر لە گەڵیا، کتێبەکەی بە دوو مانگ، بە نقە نق بە دەست خەت نووسیەوە.

وە (حاجی سوعاد سەلیم)ی ڕەسامیش کە هیچ جێیەکی کوردستانی نەدیبوو وە ڕۆژ بە ڕۆژ هەموو شتێکی بۆ ڕوون ئەکرایەوە، ڕەسمەکانی کتێبەکەی بە جیرە جیر، لە ماوەیەکی درێژا تەواو کرد.

*ساڵی ١٩٥١ لە چاپخانەی (نەجاح) لە شاری بەغدا (ئەلف و بێ)یەکەی چاپکرا.

*ساڵی ١٩٥٣ لە لایەن هونەرمەندی نەمر (بەدیع باباخان) وێنەکانی بۆ کرا. وەك خۆی ئەڵێ: (ئەم کتێبە لە لایەن هونەرمەند بەدیع باباجانەوە بە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی جوانی کوردەواری ڕازێنرایەوە).

*ساڵی ١٩٥٥ (ئەلف و بێ)یەکی بۆ گەورەکانیش دانا.



*ساڵی ١٩٥٦ لە لایەن خاتوو (تروودی میتلمان)ەوە جارێکی تر وێنەکانی کێشایەوە.

ساڵی ١٩٥٦ لە بەغداد کۆلێژی بازرگانی ئابووری تەواو کرد.

*ساڵی ١٩٦١ لە کۆلێژی سان فرانسیسکۆ لە ئەمەریکا بڕوانامەی (ماستەر)ی لە (پەروەردەو دەروونزانی)دا وەرگرت.

*ساڵی ١٩٦٨ لە زانکۆی سلێمانی بەشی ئەدەبیات کرا بە مامۆستا.

*ساڵی ١٩٨١ گوێزرایەوە بۆ هەولێرو لە (زانکۆی سەلاحەدین) کرا بە مامۆستا.

*ساڵی ١٩٨٢ گوێزرایەوە بۆ زانکۆی موستەنسرەیەی بەغداد تا خانەنشین کرا.

*ڕۆژی ١٩٩٨/٧/١٢ کۆچی دوای کردو هێنرایەوە بۆ سلێمانی و لە گردی سەیوان بە خاك سپێردرا.

# زەنگی کاروانی ڕێنووسی کوردی

ئیبراهیم ئەمین باڵدار

١-پێشەکی:

لەسەر داوای کۆڕی زانیاری عێراق ئەم لێکۆڵینەوەیەمان نووسیوە کە بخرێتە بەر چاوی ئەو کۆڕەی بەدەستەوەیە لەم نزیکانەدا بگیرێ بۆ لێکۆڵینەوەی گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی.

٢-مەبەست لە لێکۆڵینەوەکە:

مەبەستمان لەم لێکۆڵینەوەیە ئەوەیە، هەندێك لەو هەنگاوانە پیشان بدەین، کە بۆ پێش خستن و پەرەپێدانی ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی نراون و هەڵیان بسەنگێنین. بیروباوەڕی خۆشمان دەربارەی بەشێك لەو گیروگرفتانەی ڕێنووسی کوردی کە ئێستا لە کایەدان پیشان بدەین.

٣-بایەخی ئەم لێکۆڵینەوەیە:

پیشان دانی ئەو هەنگاوانەی کە بۆ پێك هێنانی ڕێنووسی ئێستای کوردی نراون، لەگەڵ دەرخستنی هەندێك لە بیروباوەڕی زانستیانە دەربارەی زمان نووسین، وە لێکۆڵینەوەی ئەو گیروگرفتانەی ڕێنووسی کوردی کە ئێستا لە ناوان، ئەبنە یارمەتی دەرێکی بەکەڵك بۆ دارشتن و، دەق پێگرتنی شێوەیەکی یەك گرتووی گشتی بۆ ڕێنووسی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی.

٤-ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:

داردەستمان لە کۆکردنەوەو پیشان دان و لێکدانەوەی زانیاری ئەم نووسینەدا ئەمانە بوون:

ا-ئەو شارەزاییە تایبەتییەی کە پەیدامان کردووە دەربارەی ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی، لەو ماوەیەدا کە خەریکی دانانی ئەلفوبێی کوردی بووین.

ب-ئەو سەرچاوەو کانگایانەی بەرچاومان کەوتوون دەربارەی ئەم باسە.

ج-شیکردنەوەو لێکدانەوەی هەندێك لەو گیروگرفتانەی ڕێنووسی کوردی کە بیرمان لێ کردوونەتەوە.

سەرگورشتەیەکی مێژوویی نووسین:

دۆزینەوەی نیشانەکان (رموز) ی نووسین، لە هەرە باڵاترین هانینە دییەکانی ئادەمیزاد ئەژمێردرێت کە بەهۆیەوە ئادەمیزاد توانیویەتی گەلێك شارستانیەتی گەورەو پڕپایەخ پێکەوە بنێت.

ئەو نیشانە نووسینانەی کە ئادەمیزاد لە شێوەی ڕەسم و خەتا، لە هەرە سەردەمی ژیانیەوە بیرو باوەڕی خۆی پێ پیشان ئەدا، لەسەر دیواری ئەو ئەشکەوتانەدا کە تیایانا ئەژیا، وە ئەو نووسینانەی کە خەڵکی وڵاتی دیجلەو فورات و، بلیمەتەکانی گوێ ڕۆخی نیل، لەسەر دیواری پەرستگەو قەبرەکانیان و، لەسەر پەیکەرو، پارچە قوڕو، پێستەو، گەڵای زەل نووسیویانە، یارمەتییەکی زۆری ئادەمیزادی ئەم سەردەمەی دا، کە بە توانایەکی باڵاو بلیمەتانەوە بچێتە ناو جەرگەی مێژووی کۆنەوەو، شارەزاییەکی یەکجار زۆر لە ژیانی ئەو دەمەدا پەیدا بکات.

سۆمەریەکان لە دەشتی عێراقدا لە پێشەنگی ئەو کەسانەوە بوون، کە سێ هەزار ساڵ لە پێش لە دایك بوونی عیساوە نووسینیان بەکارهێناوە.

لە پێشدا، ئادەمیزاد بیروباوەڕی خۆی بە خەت کێشان و ڕەسم کردنی ساکار دەرئەبڕی، دوای ساڵەهای ساڵ فێربوو لە

جیاتی ئەو خەت و ڕەسمە ساکارانە، وردە ڕەسمی نەخشاو، وە هەمەجۆرە خەتی ڕێکوپێك بەکاربهێنێت، کە بۆ هەر مانایەك چەشنە ڕەسمێك، یان نەخشێك پیشان بدات. لە پاشان هاتە سەر ئەوەی کە بۆ هەموو دەنگێك نیشانەیەك دابنێت، بە جۆرێك کە بۆ نووسینی وشەیەك نیشانەکانی دەنگەکانی ئەو وشەیە لەپاڵ یەکا ڕیز بکات، تاکو بە چاوپێکەوتنیان دەنگ و واتای ئەو وشەیە بزانرێت.

ئێستا ئێمە بەو جۆرە نیشانانە ئەڵێین: ((پیت)) یان ((حەرف)).

نموونەی باشیش لەم دەمەی ئێستای ئێمەدا بۆ نووسینی زمانێك ئەوەیە، کە بۆ هەر دەنگێك پیتێك بەکاربهێنین، وە هەر پیتێکیش دەنگێکی جوێی هەبێت.

ئەو نیشانانەی کە لەجیاتی دەنگەکانی زمانێك بەکارئەهێنرێت پێیان ئەوترێت: (ئەلفوبێ) (ALPHABET) ئەم وشەیەش لە دوو پیتی یەکەمی ئەلفوبێی ئەغریقی و یۆنانییەوە وەرگیراوە، کە پێیان ئەوترێت: (ALPHA AND BETA) ([1]).

هەندێك لەو لێکۆڵینەوانەی کە کراون، ئەوە ئەگەیەنن، کە زوربەی ئەو ئەلفوبێیانەی لە ڕۆژهەلات و خوارووی سوریادا بەکارهێنراون، کە ئەلفوبێی عەرەبیش یەکێکە لەوان لق و چڵی ئارامین.

واتا لە بریکی ((ئارامیەوە))، لقێکی ((نەبطی)) لێ بۆتەوە، لەویشەوە چڵێکی تری لێ دەرچووە، کە بۆ نووسین و خوێندنەوەی عەرەبی بەکارهێنراوە.

ئەم شێوەیەی ئێستای عەرەبیش کوتوپڕ نەهاتۆتەوە کایەوە، بەڵکو لە پەیدابوونیەوە تاکو ئەمڕۆ گۆڕانی زۆری بەسەرا هاتووە.

وە لەدوای پەرەسەندنی ئیسلام ئەم نووسینی عەرەبییە لە چینەوە تاکو ئیسپانیا بلاوبۆتەوە.

وە ئەم نووسینە لە سەرەتای پەیدابوونیا لە شێوەیەکی سێ سووچی دا بووە، هیچ خاڵ و سەرو بۆری نەبوە لەدوای ئیسلام دەستکرا بەوەی کە خاڵ و سەرو بۆری بۆ دابنرێت.([2])

**نووسین لە کوردستانا:**

لە دەمێکی دێرینەوە خوێندنەوەو نووسین لە کوردستانا بەکارهێنراون، بەلآم ئەوەی تا ئێستا ئێمە ئەزانین، ئەو نووسینە کۆنانە، بە زۆری، هەر بەو زمانانە بوون، کە لە کوردستانا بۆ خوێندن بەکارئەهێنران، وەك: فارسی و عەرەبی و تورکی.

ئەوەشی بە زمانی کوردی بووە هەر بە دەست خەت ماوەتەوە.

ژمارەیەکی زۆر لە هەڵکەوتوان و بەهرەدارانی کورد، بەو سێ زمانە، بەرهەمی گەلێك گرنگ و بالآیان هێناوەتە پێشەوە.

وە لە دوای سەدەی هەژدەمینەوە، شاعیرو ئەدیبەکان، لە میرنشینەکانی کوردستانا، بە پیتی عەرەبی، گەلێك هەڵبەست و چیرۆکی فۆلکلۆری کوردیان نووسیوە.

وە بە زۆر شێوە، بیرو هەستی گەشاوەی پڕ نرکەو ناڵەی خۆیان، لە بناری کێوەکان و، لە ژێر سێبەری بن دار گوێزەکانی کوردستان دا، درەوشاوەو پڕ هونەر، بە جۆش و قوڵپەوە دەربڕیوە.

وە لە ساڵی (١٨٧٩-١٩٢٠) دا ڕێنووسی کوردی لە دەست خەتەوە هاتە سەر چاپەمەنی.

وە لە ساڵی (١٩٢٠-١٩٢٩) بە کوردی پەتی نووسین برەوی سەندو بوو بە باو.[3]

**لە دایك بوونی ڕێنووسێکی کوردی نوێ:**

لە ساڵی (١٩٤٠) دا نووسەر بوو بە مامۆستای سەرەتایی لە قوتابخانەکانی سلێمانیدا کە لە دەها ساڵ پێشترەوە بە کوردی قوتابیان تیا فێر ئەکرا.

نووسەر لە فێرکردنی قوتابیەکاندا گیروگرفتێکی زۆری ئەهاتە ڕێ، ئەمەش هەمووی بەهۆی ناتەواوی شێوەی نووسینی کتێبە کوردییەکانەوە رووی ئەدا، کە هەر دێرەیان بە گەلێك جۆرە ڕێنووسی تێکەلآوی -کوردی و، عەرەبی و، فارسی- بە بزرکاوی و شێواوی نووسرابوون.

ئەو نووسینانە لەسەر هیچ دەستوورو یاسایەك نەئەڕۆیشتن.

نووسەرەکان هەر وشەیەکیان جارەی بە جۆرێك ئەنووسی.

بەڕاستی مامۆستاو قوتابی، هەموو بەم جۆرە نووسینانەوە جەڕابوون و، سەریان لێ شێوابوو.

نووسەریش، وەك مامۆستایەکی ئەرك لەسەر شانی داخ لە دڵ، هەمیشە بە پەرۆشەوە، بە خۆزگەو ئاواتەوە، بیری لەوە ئەکردەوە.. کە چۆن بتوانێت ڕۆژێك زووتر، کارێکی وا بکات کە چارەسەرێك بۆ ئەم شێواوی و ئالۆزاویە بدۆزێتەوە.

---

[1] Encyclopedia Britannica 15th ed. 1974. ed. Chicago, Encycyclopedia Britannica, 1974. vol. I pp. 618-624. Ibid (1) pp. 618-622.

[2] (ف-٦)

[3] حامید فەرەج، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکا، بەغداد، کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦، لاپەرە (٥-٦).

له ١/٢/١٩٤٨ دا بـه نووسـهر سـپێردرا، کـه هـهر بـه تـهنیا خۆی، له دێی جوانی ((جاسهنه)) له بنار شاخی هەژدیهای پاڵ کێـوی سـارا، وه لهسـهر سهرچـاوهی ئـاوی کاذیخـان کـه لـه ناوچـهی سورداشـه نزیـك شـاری سـلێمانی، قوتابخانهیـهکی سهرەتایی بۆ یهکهم جار دابمهزرێنێت.

لهناو باغه ڕهنگینهکانی گویّ چهمه پڕ له کانیاوهکانی ئهم دیّ یـهدا، دهستی کـرد بـه دانـانی ((ئـهلفوبیّ یـهکی نـویّ)) بـۆ ڕۆڵهکانی کورد.. بۆ ئهو منداڵانهی که له سهرەتاوه دهست به فێربوونی خوێندنهوهو نووسینی کوردی ئهکهن.

لهم دێیهدا ههلێکی باش بۆ نووسهر ههڵ کهوت که بتوانێت دهرسـهکانی ئـهو ئـهلفوبیّ یـه دابنێـت و، ڕۆژ بـه ڕۆژ، بهسـهر قوتابییهکانا تاقیان بکاتهوه.[4]

بۆ دانانی ئهم کتێبه، وه بۆ نههێشتنی ئهو کۆسپانهی که جاران نووسهرو ههموو کهسێکی تر گیریان خواردبوو پێیانهوه، نووسـهر هاتـه سـهر ئـهوهی کـه ئـهبێت پێـش هـهموو شتێك، بیر لهوه بکاتهوه، ... ۆن بناغهیهکی دروست و پتهو داڕێژێت، بۆ دهستووری ڕێنووسێکی وا، که خوێندنهوهو نووسینی کوردی ئاسان بکات بۆ قوتابییان و، هـهموو خوێنـدهواران، تاکو لهسهر ئهو دهستوورانهش ئهلفوبیّ یهکی بهجیّ ڕێك خات بۆ منداڵان.

بهم چهشنه، جڵهوی کاروانی ڕێنووسی کوردی جارێکی تر ڕاتهکێنراو، کـاروان کهوتـهوه ڕێ، زهنگیش دهستی کردهوه به لێدان.

وه دوای لێکۆڵینهوهیـــهکی زۆر، وه کــهڵك وهرگــرتن لــه بهرههمهکانی گهلێك له شۆڕه سوارانی ڕۆشنبیرانی کورد، که له پێـشترا هـهوڵێکی بـاڵاو پـڕ بایـهخیان داوه بـۆ گهشـهپێدانی نووسـینی کـوردی وهك: نووسـینه درهوشـاوهکانی مامۆسـتای بـهڕێز (سـهعید صـدقی کابـان) لـه کتێبـی (مختـصر صـرف و نحوی کوردیدا ١٩٢٨) وه بیرو باوهڕه نایابهکانی مامۆستای به نرخ (توفیق وههبی بهگ) له کتێبی (دهستووری زمانی کوردیدا ١٩٢٩)، وه بهرهـهمی مامۆسـتای بـهڕێز حامـد فـهرج لـه کتێبـی ((ئهلفوبیّ ی کوردیدا ١٩٣٦)).

نووسـهر دوای ئـهو ههوڵانـه گهیـشته ئـهوهی کـه ئـهو گیروگرفتانهی ڕێنووسـی کـوردی لـه ئـارادا بـوون، وه بهلایـهوه سهرەکی بوون، بهم جۆرەیان چارەسهر بکات:

١-که کتێبه ئهلفوبیّ یهکه تهواو بوو، وه له لایـهن وهزارهتـی مـهعاریفی ئـهو دهمـهوه، لـه سـاڵی ١٩٤٩ دا بڕیار لهسهر چاپ کردن و خوێندنی درا، زۆری ئهو شێوه پیته نویّ یانهی که تیا بـهکارهێنرا بـوو لـه چـاپخانهکانی ئـهو ڕۆژانـهدا دهسـت نهئهکهوتن. لهبهر ئهوه، وا به باش زانرا، که کتێبهکه به دهست خـهت بنووسـرێتهوه، وه وێنـهکانی ڕهسـم بکرێـت، ئنجـا وهك (کلێشه) له چاپ بدرێت.

خـهت خۆشی بـهناوبانگ (صـبری الخطـاط) کـه هـیچ کـوردی نهئـهزانی، دوای هیلاکیـهکی زۆر لهگـهڵیا، کتێبهکـهی بـه دوو مانگ، به نقهنق، بهدهست خهت نووسیهوه.

وه (حـاجی سـوعاد سـهلیم) ی ڕهسامیش کـه هـیچ جێیـهکی کوردسـتانی نـهدیبوو، پـاش ئـهوهی کـه کۆمهڵـه وێنهیـهکی کوردهواری خرایه پێش چاو، وه ڕۆژ بـهڕۆژ هـهموو شتێکی بۆ ڕوون ئهکرایـهوه، ڕهسمـهکانی کتێبهکـهی بـه جیرهجـیر، لـه ماوهیـهکی درێـژا تـهواو کـرد. ئنجا پـاش ئـهم هـهموو دهردی سهریه، له ساڵی ١٩٥١ دا، له چاپخانهی (نهجاح) له بهغداد، به شێوهی کلێشه چاپ کرا، وه بهسـهر مهکتهبهکانی لای خومانا بڵاوکرایهوه.

٢-کتێبهکه وا دانرا، که ههموو وشهیهك، کوردی بێت، یان عهرهبی، یان بێگانه، به ڕێنووسی کوردی بنووسرێت.

٣-ئـهو پیتانـهی کـه لـه کوردیـدا، هـهر یهکـهیان چـهند دهنگێکی جویّ یان ههیه، بهم جۆره پیشان دران:

ر:

(١)ر-ری وهك: دار

(٢)ڕر-ڕێی گهوره وهك: مهڕ

و:

(١)و-واو وهك: داو

(٢)وو-واوی درێژ وهك: دوور

(٣)ۆ-واوی کراوه وهك: دۆ

ی:

(١)ی-یا وهك: پهری

(٢)یّ-یای کراوه وهك: دیّ

ل:

(١)ل-لام وهك: زل

(٢)ڵ-لامی قهڵهو وهك: دڵ

أ:

ئ – ههمزه وهك: ئێمه

لا:

لا- وهك: کۆلاره

ڵا- وهك: گهڵا

[4] بهڕێزی نوسهر کاك محهمهد سهحهفی وتی: له گوندهکهی ئێمه (قهمچوغه) مامۆستا ئهوکارانه ئهنجام دهدا، ئهوکات من قوتابی باڵدار بوم. دیداری تایبهت ١/٨/٢٠٠٤

پاش چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی کتێبەکە، لە تاقی کردنەوەیدا، هەندێك گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی باشتر بۆ نووسەر ڕوون بووەوە، وە گەلێك ئامۆژگاری بەنرخیشی لە مامۆستای بە نرخ توفیق وەهبی بەگ وەرگرت، بۆیە کە بۆ جاری دووەم لە ساڵی ١٩٥٣ دا کتێبێکی ئەلف و بێی نوێی دانا، کە لەسەر شێوەیەکی پێشکەوتووتر ڕێکی خستبوو، ناوی نا (ئەلف و بێی نوێ بۆ منداڵان). ئەم کتێبە لە لایەن هونەرمەند (بەدیع باباجانە)وە بە وێنەی ڕەنگاو ڕەنگی جوانی کوردەواری ڕازێنرایەوە، وە لە بەغداد، لە چاپخانەی (مەساحە) لە ساڵی ١٩٥٣ چاپ کرا، ئەمەش یەکەم کتێب بوو کە لە وەزارەتی مەعاریفدا (وەزارەتی پەروەردەی ئێستا) بە ڕەنگاو ڕەنگی چاپ بکرێت.

لەم ئەلف و بێ نوێ یەدا ئەو پیتانەی بەیەکەوە ئەلکێن، وەها پیشان دران کە هەریەکەیان دوو شێوەیە، نەك چوار شێوە.

نووسەر وای دانا، کە ئەو کلکەی لە پێش پیتە پێوە نووساوەکانەوە ئەبینرێت، ساتێك کە لە ناوەڕاستی، یان کۆتایی وشەدا بەکارئەهێنرێن، درێژ بوونەوەیەکی پیتەکەی پێشەوەیەتی.

بەکارهێنانی شێوەیەکی جوێی ناوەڕاست بۆ پیتە پێوەنووساوەکان، تەنها لە وەختی خۆیدا، کە زوربەی چاپ کردن بە قاڵبی قورقوشم بوو، هەر بۆ ئەوە بە کەڵك ئەهات، کە قاڵبی پیتەکان بە ئاسانی بخرێنە پاڵ یەکتری. وە لە فێرکردنی خوێندنەوەو نووسیندا تەگەرەو شێواویەکی زۆری دروست ئەکرد.

بەم جۆرە لە جیاتی ئەوەی هەموو پیتێکی پێوەنووساوی وەك: (ب) بە چوار جۆرە شێوەی جیاواز فێری قوتابی بکرێت وەك: (ب، ب، ب، ب)، بە پێی ئەم گۆڕینە نوێیە، وای لێ هات کە هەر یەکێك لەو پیتە پێوەنووساوانە بە دوو شێوە فێر بکرێت، وەك: (ب، ب)، بەمە سەر لێ تێکچوون و، چەواشەبوونی قوتابیەکان لە فێربوونی خوێندنەوەو نووسیندا زۆر کەم بووەوە.

هەروەها لەم کتێبە نوێ یەدا نووسەر (ڕ) ڕێی قەڵەوی (گەورەی) بە یەك (ر) ڕێ نیشان دا، چونکی لە کتێبەکەی پێشووترا کە ئەم ڕێ یە بە دوو ڕێی (رر) پیشان دا، جاری وا هەبوو لە وشەیەکا، وەك: وشەی (بڕراو) ژمارەی ڕێیەکان ئەبوون بە چوار ڕێ، ئەمەش سەری لە خوێندەواران و نووسەران تێك ئەدا.

وە لە ساڵی (١٩٥٥) دا نووسەر کتێبێکی ئەلفوبێی تری دانا بۆ گەورە، کە ئەمەیان سێیەم ئەلف و بێ بوو، وە بەتایبەتی بۆ ئەوە دانرابوو گەورە فێری خوێندنەوەو نووسینی کوردی بکات.

دوای ئەوەی ئەم کتێبە لە لایەن وەزارەتی مەعاریفی ئەوساکەوە پەسەند کرا، لە هەمان ساڵدا لە بەغدا، لە چاپخانەی (هاوبەشی بڵاوکردنەوەو چاپ کردنی عێراق) بە ناوی (ئەلف و بێ بۆ گەورە) چاپ کرا. لەم کتێبەشدا هەمان دەستووری ڕێنووسی کتێبی (ئەلف و بێی نوێ) ی تیا بەکارهێنرا.

وە لە ساڵی ١٩٥٦ دا، نووسەر کتێبەکەی دووەمی (ئەلف و بێی نوێ بۆ منداڵان) ی جارێکی تر گۆڕی، وە کتێبەکە بە پوختەکراوی، وە بە گەلێك وێنەی جوانی کوردەواری یەوە، کە ژنە هونەرمەندێکی ئەڵمانی (ترودی میتلمان) بە ڕەنگاوڕەنگی ڕەسمی کردبوون، لە بەغدا، لە چاپخانەی (رابطە) لە ساڵی ١٩٥٦ دا بە ئوفسێت چاپ کرایەوە.

لەم چاپە پوختەکراوەدا نووسەر پیتی ڕێی قەڵەوی (گەورەی) بۆ یەکەم جار بە یەك ڕێنووسی و، لەژێریشیا نیشانەیەکی حەوتی دانا (ڕ). وە بۆیەکیش ئەم نیشانەیەی لەژێر ڕێ یەکەدا دانا، وە لەسەر ڕێیەکەی دانەنا، تاکو لەگەڵ پیتی (ژ) دا لەلای قوتابیە منداڵەکان تێکەڵاو نەبن و، جیاکردنەوەو ناسینەوەیان ئاسانتربێت. چونکی ئەو پیتانەی کە زۆر لە یەك ئەچن لە شێوەیانا، یان لە دەنگیانا، منداڵ چەواشە ئەکەن و، سەریان لێ تێك ئەدەن.

٤-واوی پێوەندی (واوی عە طف):

یەکێك لەو گیروگرفتانەی کە لەدانانی ئەو کتێبە ئەلف و بێ یانەدا هاتنە پێشەوە، ئەوەبوو کە واوی پێوەندی (عە طف) چۆن بنووسرێت.

لە عەرەبیدا واوی پێوەندی لەتەك وشەی دووەمدا لە دەم دەرئەچێت، وەك: (انا، وانت)، لەبەر ئەوە لە نووسینیشا ئەو واوی پێوەندیە لەگەڵ وشەی دووەمدا ئەنوسرێت، وەکو: (وانت).

بەڵام لە کوردیدا، واوی پێوەندی، ئەگەر پیتی (ە) ی لەدوا نەبێت، لەگەڵ وشەی یەکەمدا لەدەم دەرئەچێت، وەکو: (من و، تۆ). لەبەر ئەوە، نووسەر لەو کتێبانەدا، وای دانا، کە ئەم جۆرە

واوە لەپاڵ وشەی یەکەمدا بنووسرێت، نەك لە ناوەڕاستی هەردوو وشەکەدا.

بەڵام ئەو واوی پێوەندییەی کە پیتی (ە) ی لەدوا بێت، وەك: (وە)، وای دانا، کە لەبەینی هەردوو وشەکدا بنووسرێت، وەکو: (ئەمان وە ئەوان).

٥-پیتەکانی ئەو ئەلفوبێ یەی کە نووسەر بەکاری هێنان لە کتێبەکانیا (٣٦) پیت بوون. ئەو پیتانەش ئەمانەن:

| | | | |
|---|---|---|---|
| ء | (هەمزە) | ش | (شین) |
| ا | (ئەلف) | ع | (عەین) |
| ب | (بێ) | غ | (غەین) |
| پ | (پێ) | ف | (فێ) |
| ت | (تێ) | ڤ | (ڤێ) |
| ج | (جیم) | ق | (قاف) |
| چ | (چیم) | ك | (کاف) |
| ح | (حێ) | گ | (گاف) |
| خ | (خێ) | ل | (لام) |
| د | (دال) | ڵ | (ڵام) |
| ر | (رێ) | م | (میم) |
| ڕ | (ڕێی گەورە) یان (ڕێی قەڵەو) | ن | (نون) |
| ز | (زێ) | و | (واو) |
| ژ | (ژێ) | ۆ | (واوی کراوە) |
| س | (سین) | وو | (واوی درێژ) |
| ه | (هێ) | ڵا | (ڵا) |
| ە | (ئە) | ی | (یە) |
| لا | (لا) | ێ | (یەی کراوە) |

٦- لە ساڵی (١٩٥٢) دا، نووسەر لە (مودیریەتی مەناهیج و، وەسائیلی تەعلیمی) لە وەزارەتی مەعاریف-وەزارەتی تەربیەی ئێستا-دامەزرا. وە یەکێك لە ئیشەکانی ئەوە بوو، کە سەرپەرشتی دانان و، بژارەکردن و، چاپ کردنی کتێبە کوردی یەکانی مەکتەبەکان بکات.. ئەو کتێبانەی کە هەر یەکیان بە جۆرە ڕێنووسێکی تێکەڵاوی شێواوی ئاڵۆزاو نووسرابوو، بێجگە لە هەڵە چاپەمەنیەکانیان کە یەکجار زۆر بوون، وە هەر دێڕێکیان ئەبوایە خوێندەوار، وەك مەتەڵ، یان شفرە هەڵی بهێنێت.

وە لەبەر ئەوەی، هەر لە ساڵانی پێشبووەوە، چەوتی ئەو کتێبانە، داخێکی گران گران بوو لە دڵی نووسەردا، وە چارەسەرکردن و، چاك کردنیان، خۆزگە و ئاواتێکی شیرین بوو لای، لە یەکەم ڕۆژەوە، بە گەرمی و، بە پەرۆشەوە، دەستی کرد بە پوختەکردن و بژارەکردنی ئەو کتێبانە بەو ڕێنووسەی کە کتێبە ئەلفوبێ یەکەی لەسەر دانابوو، سەر لەنوێ هەموو کتێبەکانی نووسی یەوە.

وە بۆ ئەوەی لە چاپخانەکان دا، کە کرێکارەکانیان کوردیان نەئەزانی، بۆشایی بەینی وشەکانیان بۆ ڕوون بێتەوە، بە هێڵێکی لابەلای وەك ئەم هێڵە (/) جێی بۆشاییەکانی (Spaees) بەینی وشەکانی ناو هەموو کتێبەکانی نیشانە کرد.

بەڵام کە هاتە سەر ئەوەی دەست بە چاپ کردنیان بکاتەوە، تەگەرەیەکی سەختی هاتە پێش، ئەوەش ئەوە بوو، کە ئەو پیتە نوێ یانەی بەکاری هێنابوون وەك: (واوی کراوە، یەی کراوە، لامی قەڵەو، لەدواییدا ڕێی گەورەی نیشانەی حەوت لە ژێر ((ڕ)) ) لە چاپخانەکانی ئەو دەمەدا، لە بەغدا دەست نەئەکەوتن.

لەو ڕۆژەوە کە نووسەر لە وەزارەتی مەعاریف دامەزرا لە ساڵی ١٩٥١ دا، گفتوگۆی لەگەڵ خاوەن (چاپخانەی نەجاح) کرد لە بەغدا.

وە پێی ووت کە ئەم ئەلف و بێیەی خۆی لە لایەن وەزارەتی مەعاریفەوە پەسەند کراوە، هەندێك پیتی نوێی تیا بەکارهێنراوە، کە ئەبێت لەمەولا لە کتێبە کوردی یەکانی تریشا بەکاربهێنرێن، وە ئێستا لە چاپخانەکان دەست ناکەون، ئەگەر بێت و ئەم، زووتر، لە دەرەوە پەیدایان بکات، چاپ کردنی زوربەی کتێبە کوردیەکانی قوتابخانەکان، بەوهۆیەوە، بەم ئەدرێت. ئەویش پێی وت: ئەگەر ئێوە ئەم بەڵێنەم پێ بدەن من ئەتوانم بە زوویی ئەو پیتانە لە دەرەوە بهێنم.

وە ئەوەشی باس کردو وتی: کە وەختی خۆی مامۆستای بەنرخ توفیق وەهبی بەگ، پێی وتووم کە هەندێك لەم جۆرە پیتە کوردییە نوێ یانە بهێنم، بەڵام چونکە ئەوساکە بازاڕیان نەبوو، نەم توانی بیان هێنم.

وە دوای ئەوەی نووسەر پیتە کوردی یە نوێ یەکانی بۆ خاوەن (چاپخانەی نەجاح) نووسییەوە، ئەویش ناردی بۆ دەرەوە، زوو پیتەکانی بۆ دروست کراو، بۆیان نارد.

بە دوای ئەوەدا گەلێك لە کتێبە کوردیەکانی درایە کە بەو پیتە نوێ یانە چاپیان بکات.

کە خاوەن چاپخانەکانی تری بەغدا ئەمەیان بیست، گورج ئەوانیش داوای ئەو پیتانەیان کرد لە دەرەوە، لە ئەڵمانیاو،

ئینگلتەرەوە بۆیان هات. ئەم پیتانە هەموو قاڵبی قورقوشم بوون کە بە دەست ڕێك ئەخران. بە دوای ئەمەشا فابریقەی (لاینوتایب، ئنجا مونوتایب، لە پاشان ئینترتایب) هەموو ئەو پیتە کوردیە نوێیانەیان خستە سەر مەکینەکانیان. ئەو مەکینانەی کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی خێرا خێرا، قاڵبی پیت و دێڕ دائەڕێژن.

وە ك ئیش هاتە سەر ئەوەی دەست بە چاپکردنی کتێبە کوردیەکانی قوتابخانەکان بکرێت، کە بەو ڕێنووسە نوێیە سەرلەنوێ نووسرابوونەوە، ئەبوایە بۆ هەموو کتێبێك یەکێك دابنرێت کە سەرپەرشتی چاپکردنی کتێبەکە بکات.

و لەبەر ئەوەی ئەو ڕۆشنبیرانەی کورد، کە ئەو دەمە لە بەغدا بوون و ئەم ئیشەیان پێ ئەکرا، چاك شارەزای ڕێنووسە نوێیەکە نەبوون. نووسەر ناچار بوو کە ئەوانەی ئەم ئیشەیان پێ ئەسپێررا، زۆر لەگەڵیانا خەریك بێت تاکو شارەزاییەکی تەواو لە ڕێنووسە نوێ یەکەدا پەیدا بکەن، بۆ ئەوەی بتوانن بەباشی سەرپەرشتی چاپکردنی کتێبەکان بکەن بەو ڕێنووسە نوێیە.

دوای چاپکردنی کتێبەکان ، کە بەسەر مەکتەبەکانا بلاوکرانەوە، لەپێشەوە مامۆستایان، وەك هەموو گۆڕانێکی نوێ، هەندێك لێیان ڕامان و، پێیانەوە خەریك بوون، لەپاشان چونکی هەموو کتێبەکان چونیەك، بەیەك جۆرە ڕێنووس نووسرابوونەوەو چاپ کرابوون، زوو لەسەریان ڕاهاتن و بینیان پێوەگرت. وە لەگەڵ قوتابیەکانا، بەتەواوی حەسانەوە.

بەم چەشنە کاروانی ڕێنووسی نوێی کوردی، بەرەو ئامانج ملی ناو لێی نزیك بووەوە، دەنگی زەنگیشی بەسەر هەموو شاخ و، بەناو گشت دۆڵێکی کوردوستانا بڵند بڵند بە بەرزی بلاو بووەوە.

ئاواتی نووسەریش، لەگەڵ خۆزگەی پەرۆشی عومرا، بە درەوشاوی و فراوانی هاتەدی.

**بایەخی ئەم ڕەنج و هەوڵە چی بوو؟**

لەم دەمەی ئەمڕۆدا، کە ئاخرو ئۆخری سەدەی بیستەمە. وەلەم ڕۆژانەدا کە زانستی و تەکنەلۆجی، بەتین و، بەگوژم، بەرەو ژیانێکی نوێ، ڕووەو ئامانجێکی تازە، کەوتۆتە گۆڕان و پێشکەوتن.

وە لەکاتێکا، کە ئەم گۆڕانە بەتەوژمە گشت لایەکی گرتۆتەوەو، هەموو تیرەو هۆزو گەلێکی هێناوەتە جووڵەو بزوتن. گەلی کوردی ئێمەش، کە تاکو بەینێکی زۆری دوورو درێژ، لەناو جانەوەرو دڕندە، بەسەر لوتکەی شاخەکانی کوردوستانا چۆکی دادابوو، وە ژیانێکی تایبەتی بۆ خۆی پێکەوە نابوو، وە بە جەنگاوەری بەرەنگاری ئەو پیاو خۆرانە ئەبوو کە بە خراپە نزیك بێشەو کێوە بڵندەکانی ئەبوونەوە، ئێستا وا لەم چەرخەدا، لێ هاتوانە، بە هێزو گوڕەوە، هاتۆتە پێشەوە، لەگەڵ کاروانی گەلانا، بە گورجی و شاسواری و چالاکی، کەوتۆتە ڕێ.. بەرەو ژیانێکی سەربەرزی و ئازادی، ڕووەو ئامانجێکی پڕ کامەرانی و ڕووناکی، ملی ناوەو، تەکان ئەدات.

بەوەی کە ئێستا ڕۆڵەکانی، بە سایەی شۆڕشی ١٧ی تەموزەوە، بە زمانی شیری خۆیان، بێ گیروگرفت و سەرلێ شێوان، ئەخوێنن، هەستیان بە توانای خۆیان کردووەو، خۆیان ناسیوە.

کەوتونەتە ئەوەی بەو خوێندنە، بەهرەکانیان بپشکوێت و توانای بێ پایانیان وەك کانی بتەقێتەوەو، بڕوایان بە خۆیان بەهێزتر ببێت.

ئێستا وا خەریکن، چاویان ئەوڵن و خۆیان ڕائەتەکێنن، کە وەك مرۆڤێکی بە نرخی بە کەڵك، بێنە کایەوە، بۆ ئیشی جوان و بالاو پڕ سوود..

ئیشێك کە بە دوور و درێژی لە پێشەوە ڕێك خرابێت و خەتی بۆ کێشرابێت.

ئیشێك کە ڕەنجی لە گەلا بێ سوود نەڕوا، وە لە زووترین کاتا، بە کەمترین ئەرك و پارە، چاکترین و، زۆرترین بەروبووم بهێنێتەدی.

بەم جۆرە ئەو ڕێنووسە نوێیە، بوو بە هۆی ئەوەی کە خوێندن بۆ منداڵانی کورد ئاسان بکات، کە وەك ڕۆڵەیەکی ڕەسەنی بەکار، بۆ ئەم ڕۆژەی ئەمڕۆمان پێ بگەن:

. ڕۆڵەیەك کە لەش ساغ و پتەو بێت. بیرو دەروونی بە پاکی، بێ گرێ پەروەردە بکرێت.

. ڕۆڵەیەك بڕوای قایم بێت بە خۆی، وە دڵی پڕ لە شانازی بێت بۆ گەلەکەی و وڵاتەکەی.

. ڕۆشن بیرو، شارەزاو، هونەرمەند بێت، هەرگیز دەست لە ڕاستی و حەق بەرنەداو پاك بێت.

.هەمیشە لایەن گیری چاکەو ئاشتی بێت، دەرك بە جوانی بکات و، تامی لێ بچێژێت.

. لە بیرکردنەوەو ئیشیا، حەز بە: داهێنان بکات، لە هەرەوەزیو ئیشی کۆمەڵایەتیا بە گەرمی و چالاکی بەشداری بکات.

. ڕۆڵەیەك کە زانستی بکات بە چرای دەستی خۆی، لە ژێر ڕووناکیا بە ژیری و لێکۆڵینەوە هەموو کۆسپ و گیروگرفتێك ئاسان بکات.

. ڕۆڵەیەك کە بزانێت چۆن کەڵك لە کاتی خۆی وەربگرێت، بۆ حەسانەوە، گەشەپێدانی بیرو هۆشی، وە بۆ پەروەردەکردنی ...ش و، دەرك و، هەستی.

. ڕۆڵەیەك کە بڕوای بە خۆی زۆر بێت، وە بتوانێت لە ژیانیا ڕێگا بۆ خۆی پاك بکاتەوە، وە ئیشوکار بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

. ڕۆڵەیەك کە بتوانێت بە زمانی گەلەکەی هەموو شت وەرگرێت، وە بەو زمانەش بیرو هەستی خۆی درەوشاوە بە جوانی و داهێنانەوە دەربڕێت.

. ڕۆڵەیەك کە حەز بە ئیش و کاری باڵا بکات، کارێك کە وردو، هەڵ کەوتوانە بێت و، دڵی خۆی پێ خۆش بکات.

. ڕۆڵەیەك کە لە کردارو ڕەفتاریا، وە لە دوان و گفتوگۆیا، مەردانەو دڵسۆزو، بە ویڵ بێت. هەمیشە کەسانی پاکی تری لا بەنرخ و بەڕێز بێت.

## خوێندنەوەو نووسین

### خوێندنەوە چی یە؟

ئێمە ئەزانین کە ڕێنووس هۆیەکە بۆ ئاسان کردنی خوێندنەوەو نووسین. خوێندنەوە بەو کارە ئەڵێن کە بەهۆی وشەی نووسراوەوە، ئەو واتانە تێ بگەین کە نووسەر ویستوویەتی دەریان بڕێت.(٥)

نموونەی باشیش بۆ خوێندنەوە ئەوەیە کە بتوانین بە کەمترین ڕاوەستان، چاو بەسەر زۆرترین وشەدا بخشێنین و، یەکسەر واتاکانیان تێ بگەین، بێ ئەوەی هیچ جولەیەك، یان دەنگێك لە دەممان، یان قورگمان دەرچێت. بە جۆرێك کە یەکێکی گەورەی خوێندەوار بتوانێت بە لای کەمەوە لە دەقیقەیەکا (٣٠٠-٣٥٠) وشەی ناسراو بخوێنێتەوەو، تێیان بگات (٦).

**جووڵانەوەی چاو لە خوێندنەوەدا:**

بەپێی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراون لەسەر جووڵاندنەوەی چاو لە کاتی خوێندنەوەدا، ساغ بۆتەوە کە ساتێك چاو ئەخشێت بەسەر نووسینا، بە بازدان و ڕاوەستان تێی ئەنوارێت.

چاو لە ساتی بازداندا هیچی بۆ ناخوێنرێتەوە، بەڵام کە ڕاوەستا، ئەوسا چی دیبێت بۆی ئەخوێنرێتەوە، ئەم ڕاوەستانەش (**Fixation**) دەوری ١/٢٥ ثانیەیەك درێژە ئەکێشێت.

وە لە هەموو یەکێك لەم ڕاوەستانانەدا لە ئینجێکەوە تاکو ئینج و نیویك نووسراو ئەبینێت، بێ ئەوەی پێ ویست بەوە بکات، پیتەکان یەکەیەکە، بە جیاوازی، بۆیان بڕوانێت و، دوای لێك دانیان وشەکان ببینێت.

چاو تاکو لەسەر دێڕێك کەمتر بۆی ڕاوەستێت، نووسینەکە خێراتر ئەخوێنێتەوە. هەندێك جار چاو لە وەختی خوێندنەوەدا ئەگەڕێتەوە بۆ دواوە، ئەم گێڕانەوەیەش (**Regression**) وەختێك ڕووئەدات کە نووسینەکە جوان چاپ نەکرابێت، یان وشەی ڕەق و، درێژو، گرانی تیا بەکارهێنرابێت.

ئەم بزوتنەوەی چاوە لە کاتی خوێندنەوەی بە بێ دەنگی (صامت) دا، وەك ئەو بزووتنەوەیە نیە کە لە ساتی خوێندنەوەی بە دەنگ بەرزی (جەهری) دا ڕووئەدات.

لە کاتی خوێندنەوەی بە دەنگ بەرزیدا ڕاوەستانی چاو، وە گەڕانەوەی بۆ دواوە زیاتر ئەبێت، وە زیادبوونەکەشی بەو گوێرەیە ئەبێت کە تاکو چ ڕادەیەك خوێندەوارەکە ئەتوانێت وشەکان بە دەم دەربڕێت.(٧)

---

[5] Edward B. Fry, Elementary Reading Instruction , New York : McGraw-Hill Book Co. , 1977. P. 4.

Amonymous, perspectives on Elementary Reading, Edited by Robert Kavlin, New York : Harcourt Brace Jovanovich, Inc, 1973. P.317.

[7] S. Gray, The Teaching of Reading and Writing, Switzerland, UNESCO, 1956. PP. 45-49. William

**باشترین خەت نووسین چۆنە؟**

باشترین خەت نووسین ئەوەیە کە نووسەر، بە شێوەیەکی گونجاو قەڵەم بگرێت، بێ ئەوەی خۆی بجەڕێنێت و، پەنجەی بگوشێت و، ماسولکەکانی کرژ بکات. وە لە بارێکی تەواوا خۆی ڕاگرێت، وە بە ڕێنوسێکی ڕوون و ڕەوان، وە هێڵ کێشانێکی بێ گرێ و، پچڕ پچڕ و، ڕاوەستان، گورج و، سووک و، ئاسان، وشەکان ڕێک و جوان، هەریەکەیان، سەرتاپا بەسەریەکەوە، لە جێی خۆیا بنووسێت، لەگەڵ دانانی ئەو نیشانانەدا (Punctuation) کە مانای وشەی ناو ڕستەکان باشتر دەرئەخەن.(٨)

بەم پێیە، لە چارەسەرکردنی هەموو گیروگرفتێکی ڕێنووسی زمانەکەمانا، پێویستە ئەو چارانە پەسەندبکەین کە بەشێوەیەکی باشتر خوێندنەوەو نووسین ئاسان ئەکەن.

بۆ هێنانەدی ئەم مەبەستە، نووسەر ئەم بیرو باوەڕانە ئەخاتە پێش چاو:

١-هەموو کوردێك لە وڵاتی عێراقا، منداڵ بێت، یان گەورە، لەگەڵ زانینی خوێندنەوەو نووسیندا بە زمانەکەی خۆی، پێویستە خوێندنەوەو نووسین بە زمانی عەرەبییش بزانێت.

وەلەبەر ئەوەی خوێندنەوەو نوسینی زمانی کوردی و عەرەبی، هەردووکیان بەیەك جۆرە پیتی تایبەتین، بێجگە لە هەندێك جیاوازی کەم نەبێت، واچاکە لە دانانی ڕێنووسی کوردیدا ئەوە بخەینە بەر چاو، کە پیتێکی وەها بەکارنەهێنین کە شێوەکەی، یان بەندەکەی خوێنەری کوردی عەرەبی زان چەواشە بکات و سەری لێ تێك بدات.

وەکو ئەوەی کە ئێستا – کۆڕی زانیاری عێراق – لەسەری ئەڕوات، کە بۆ فۆنێمی ((PHONEME))*، دەنگی ((واوی درێژ)) نیشانەی، گرافێمی (GRAPHEME)** (واوی سەردار) بەکارئەهێنیت، لەساتێکا کە ئەو نیشانەی (سەرە-فەتحەیە) لە نووسینی عەرەبیدا بۆ دەنگێکی کراوە بەکارئەهێنرێت.

یان (کۆڕ) بۆ (فۆنێمی) یای درێژ (گرافێمی) نیشانەی یای سەرداری وەك: (ێ) بەکارئەهێنرێت، کەلەنووسینی زمانی عەرەبیدا ئەم (گرافێمە) (ێ) دەنگێکی تری هەیە.

بێگومان ئەم جۆرە جیاوازیە ئەبێتە هۆی ڕامان و، سەرلێ شێوانی خوێنەرو، نایەڵێت بێن بەخوێندنەوەوە بگرێت و، خێرا واتای نووسراوەکە تێ بگات، کە خوێنەر لەخوێندنەوەی وشەیەکا ئەگاتە سەر ئەم جۆرە پیتە (گرافێمە)، لێی هەڵئەنوتێت و ڕائەمێنیت. ناتوانێت زوو بزانێت ئەم وشەیە عەرەبیە، تاکو نیشانەی (فەتحەکەی) وەك: (سەر) بخوێنێتەوە یان کوردی یە وەك: (بۆر) بخوێنێتەوە. بەم جۆرە ڕاوەستانەکانی چاوی زۆرئەبن و، خوێندنەوەکەی خاوو سست ئەبێت.

وە بۆ ئەوەی ئەم ڕاستیەمان فراوانترو، قووڵتر بۆ ڕوون ببێتەوەو، با سەرنج لەم بیرو باوەڕانەش بدەین:

أ-توانای خوێندنەوە چەند جۆرە چابوکیەکە (مەهارەتێکە) کە بە ڕاهاتنێکی جارلەدوای جاری ژێر چاودێری و ڕابەریدا، پلە لەدوای پلە، دروست ئەبێت و، پەرە ئەسێنێت و، لەشێوەیەکی تایبەتیدا دەق ئەگرێت.

ب-توانای وشەو پیت ناسینەوە بەهۆی پێوەندیەکی (اشتراطیە وە) CONDITIONING، دروست ئەبێت، کە پێشی ئەوترێت LAW OF ASSOCIAYION واتا، دەستووری جووت بوون، یان بەند بوون، یان پێوەندبوون، ئەو پێوەند بوونەش بەهۆی ڕاهاتنەوە پەیدا ئەبێت، بەجۆرێك کە خوێنەرەکە وای لێدێت کە بە بینینی وشەکە، یان پیتەکە، دەنگەکەی دێتەوە بیر، ئەو دەنگەش واتای وشەکەی ئەهێنێتەوە یاد.

لەدواییدا وای لێدێت، کە وەکو لە پێشدا باسمان کرد، کەهەر بەبینینی شێوەی وشەکە، ڕاستەوخۆ واتاکەی تێبگات، بێ ئەوەی دەنگەکەی بکات بە بەڵگە.

ج-وە لەبەر ئەوەی خوێندنەوە، واتا زانینە، واتا زانینیش، بەو جۆرە باشتر دێتە دی، کە خوو بەوەوە بگرین، کە نووسینەکە وشە وشە، پچڕ پچڕ، نەخوێنینەوە، بەڵکو هەموو چەند وشەیەك، کە واتایەکی تەواو ئەبەخشن، بە چاوپیاخشاندنێك سەرتاپا، بەسەر یەکەوە بۆیان بنواڕین، بەمە ئێمە ئەتوانین وەها ڕابێین، کە بە چابوکی و خێرایی، نووسراو

---

[8] Anderson, paul s, Language skills in Elementary Education, Second edition, New York : Macmillan Publishing co., Inc. 1972.PP. 171-206.

* فۆنێم Phoneme بە بچوکترین دەنگی قسە ئەوترێت کە پێویست ئەبێت بۆ گۆڕینی واتایەك. یان هەر یەکێك لەو دەنگانە ئەوترێت کە وشەیان لێ پێك دێت و، ئەبنە هۆی گۆڕانی واتاکەی.

** گرافێم Grapheme بەو تاکە، یان چەند نیشانەیە ئەوترێت، کە دەنگێکی فۆنێمی پێ ئەنووسرێت، وەکو ئەوەی دوو پیتی واو (وو) بنووسرێت بۆ پیشاندانی فۆنێمی واوی درێژ. یان پیتێکی ڕێی نیشانەی حەوت لە ژێر (ر) بنووسرێت بۆ فۆنێمی ڕێی گەورە.

بخوێنینەوە، وە بە بینینی وشەکان کوتوپڕ، بە قووڵی و فراوانی، واتاکانیان تێی بگەین و کارمان تێ بکەن.

بە پێچەوانەی ئەوە، ئەگەر هات و ئێمە وا فێربووین کە پیت پیت، وشەکان بخوێنینەوەو، لێکیان بدەین، ئنجا تێیان بگەین، ئەبینە خوێنەرێکی کۆڵی سست، کە وشەکان پچڕ پچڕ بخوێنینەوەو، پیانەوە بچەرێین، نەتوانین بە خێرایی کوتوپڕ تێیان بگەین.(٩)

بەم جۆرە بەکارهێنانی چەشنە پیتێك، یان نیشانەیەکی وا کە لە نووسینی کوردی دا فونێمێکی (دەنگێکی) جیاوازی هەبێت لە فۆنێمی ئەو پیتە، یان ئەو نیشانەیە، کە لە نووسینی عەرەبیشدا ئێمە فێری ئەبین و پێوەڕادێین، ئەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەر نووسینەکە پیت پیت، پچڕ پچڕ، بخوێنێتەوە، وە بە خاوی و، دوو دڵی و، ڕاوەستانێکی زۆرەوە چاوی بەسەرا بخشێنێت.

٢-لەگەڵ ئەوەدا کە وەك لە پێشترا باسمان کرد نموونەی باشی لە ئەلفوبێ ی زمانێکا ئەوەیە کە بۆ هەموو دەنگێکی جیاواز پیتێکی تایبەتی هەبێت، بەڵام لە زۆربەی ئەلفوبێی زمانەکانی سەرزەمینا ئەم نموونەی باشیە نەهاتۆتە دی. وە کارێکی ئاسان نییە ئێستا ئێمەش بتوانین، پیتە عەرەبیەکان، یەکجاری وا دەستکاری بکەین، کە بەتەواوی، پڕ بە پێستی هەموو دەنگە (فۆنێمە) جیاوازەکانی گشت زاراوەکانی زمانی کوردی بسازێن و بگونجێن، بێ ئەوەی خوێنەرەکانمان، لە خوێندنەوەو نووسینی کوردی و عەرەبیدا سەریان لێ تێك بچێت. وەك ئەوەی خەریك بین، وێنەیەکی جیاوازی وەك: (ێ) بۆ دەنگی (یەی درێژ) بەکاربهێنین، بەو جۆرەی کۆڕی زانیاری دایناوە، ئەو دەنگەی کە جاری وا هەیە دەنگدارە وەك: (بیر)، جار جاری تریش نیوە دەنگدارە وەك (کانی).

یان بێین نیشانەیەکی تایبەتی بۆ دەنگی (ژێری کورت) دابنێین، کە بە کوردی بە ((بزرۆکە)) ناو ئەبرێت وە بە عەرەبیش ئەوترێت: (الکسرة المختلسة)، وەك: (کسردن Kirdin). یان بێنین نیشانەیەکی تایبەتی بۆ دەنگی ة وەك: (شوێن)، یان بۆ دەنگی u وەك: (قویل) کە لە هەندێك زاراوەی باجەلانی و کرمانجی ژووروودا هەن بەکاربهێنین.(١٠)

یان هەر بەو جۆرە بیر لەوە بکەینەوە کە نیشانەیەکی تایبەتی بۆ دەنگی (د) ی کلۆر دابنێین، وەك لە وشەی (ئەردەڵان) دا هەیە.

هەندێك پیت لە زمانی کوردی گەلێك زمانی تریشا لە دەنگێك زیاتریان هەیە، وە جاری واش هەیە دوو پیت کە ئەکەونە یەك دەنگێکی تایبەتی جیاواز پێك دێنن، ناو بە ناویش نیمچە دەنگێکی شاراوە لە بەینی دەنگە کانی دوو پیتا خۆی دەرئەخات، بێ گومان کارێکی ڕاست نییە ئێمە خەریك بین بۆ هەموو یەکێك لەم دەنگانە پیتێك دابنێین.

زۆر کردنی شێوەی پیتەکانی ئەلف و بێی کوردی بەو جۆرە، ئەبێتە هۆی خاوی و لەنگی و سەختی خوێندنەوە و نووسینی کوردی، لە جیاتی ئاسان کردنیان. (چونکە ئێمە لە خوێندنەوەدا "واتا" ئەخوێنینەوە نەك "پیت").

وەلە لایەکی تریشەوە، وەك لە پێشەوە باسمان کرد، ئێمە لە خوێندنەوەدا چەند وشەیەك بەسەر یەکەوە، بە شێوەو قەرینە context ئەناسینەوەو واتاکانیان تێ ئەگەین، بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات کە حونجەیان بکەین، وە فۆنێمەکانیان، یەکە یەکە، جیابکەینەوەو، لێکیان بدەین و دەریان ببڕین، ئنجا تێیان بگەین.

بەڵام لەگەڵ ئەمانەشا کارێکی زۆر پێویستە کە بۆ مەبەستی فەرهەنگ دانان، (کۆڕی زانیاری) لیژنەیەك لە شارەزایانی فونەتیك دابنێت بۆ ئەوەی هەموو جۆرە دەنگەکانی ئاخاوتنی زاراوەکانی زمانی کوردی، بزوێنەکان و کونسونانتەکان بە بنك و لق و چڵیانەوە، وە بە گوێرەی گۆڕانیان بەپێی جێگاو، تەنگ پێ هەڵچنینی دەنگی ترەوە، دوای شیکردنەوە، ڕونیان بکەنەوە و ئاشکرایان بکەن. وە بە نیشانەی تایبەتی پیشانیان بدەن، تاکو ببنە کلیلی ئاخاوتنی وشەکانی ناو فەرهەنگەکان.

**ئەنجام:**

بەگوێرەی ئەو بیرو باوەڕانەی باس کرا نووسەر ئەم پێشنیارانە ئەخاتە بەر چاو:

**١-ئەلف و بێی کوردی بە پیتی عەرەبی:**

**بەم جۆرە دەقی پێبگیرێت:**

---

9 Deboer, John J. and Dallmann, Martha, The Teaching of Reading, New York : Henry Holt and Company, 1960. PP. 25,26.

10 ئەم نموونانە لە نووسینێکی دکتۆر جەمال نەبەزەوە وەرگیراوە، کە بە ناوی (زمانی یەکگرتووی کوردی) لە ئەڵمانیا، لە ساڵی ١٩٧٦ دا بڵاوکراوەتەوە. لاپەڕە (٧٨-٩٠).

ا ، ئ ، ب ، پ ، ت ، ج ، چ ، ح ، خ ، د ، ر ، ڕ ، ز ، ژ ، س ، ش ، ع ، غ ، ف ، ڤ ، ق ، ك ، گ ، ل ، ڵ ، م ، ن ، و ، ۆ ، وو ، ه ، ە ، لا ، ڵا ، ی ، ێ .

**٢-واوی پێوەندی (عەطف):**

لەبەر ئەو هۆیانەی لەپێشەوە باسمان کردن، چاکتر وایە بۆ ئاسانی خوێندنەوەو نووسین، کە واوی پێوەندی، واوی (عەطف) نزیك وشەی پێشەوەی واوەکە بنووسرێت وەك: (من و تۆ).

وە ئەگەر واوەکە پیتی (ە) ی لەگەڵا بوو، وەك: (وە) ئەوساکە لە بەینی وشەی پێشەوەی و، وشەی دوای خۆی بنووسرێت، وە: (ئەمان وە ئەوان) بەو جۆرەی کە ئێستا پەیرەوی ئەکرێت.

**٣-(ڕ) ڕێی گەورە، ڕێی (قەڵەو):**

لەبەر ئەو هۆیانەی لە پێشەوە باسمان کرد، باشتر وایە، بۆ ئاسانی خوێندنەوەو نووسین و، چەواشە نەبوونی خوێنەر، کە (ڕ) ی گەورە کڵاوەکەی لە ژێریا بێت، وەك ئەوەی ئێستا پەیرەوی ئەکرێت، نەك وەك ئەوی کۆڕی زانیاری بەتەنیا لە سەری ئەڕوات، کە کڵاوەکە لەسەر ڕێ یەکە دا ئەنێت و شێوەکەی لەگەڵ شێوەی پیتی (ژ و ز) لە بەرچاوی خوێنەر تێکەڵاو ئەبێت. چونکە جیاوازی بەینی پیتی "ڕ" لەگەڵ ئەو دوو پیتەدا ئەوەیە، کە "ڕ" هیچ خاڵێکی لەسەر نییە، ئنجا ئەگەر هاتوو ئێمە کڵاوێکمان خستە سەری، ئەوا ئەمیش هەر وەك یەکێك لەوان دێتە بەرچاو.

وە لەبەر ئەوەی هەموو "ڕ" ڕێ یەکی پێشەوەی وشەی کوردی ڕێ یەکی گەورە، هەندێك کەس وای بەباش ئەزانێت کە پێویست ناکات نیشانەی کڵاوی لە ژێرا دابنرێت. ئەمەش ڕاست نیيە چونکی بەهۆی دانانی ئەو نیشانەیەوە وشەکە چاکترو زووتر ئەناسرێتەوە و ئەخوێنرێتەوە، لەسەر ئەو دەستوورەی کە ئەڵێت : ئەوانەی شێوەیان چوون یەکە، دەنگیشیان (ئاخاوتنیان) وەك یەك ئەبێت.[11]

**٤-واوی درێژ:**

لەبەر ئەو هۆیانەی کە لە پێشەوە باس کران، بۆ ئاسان کردنی خوێندنەوەو نووسین، باشتر وایە، واوی درێژ وەك ئێستا لای گشت خوێندەواران پەیرەوی ئەکرێت (کۆڕی زانیاری نەبێت)، بە دوو واو بنووسرێت نەك بە واوێکی سەردار.

هەروەها واوی درێژ، ئەگەر لە پێشەوەی وشەشەوە هات، بۆ ئاسانی خوێندنەوە، هەر بە دوو واو بنووسرێت وەك: (وشە، وتن، وریا..).

کۆڕی زانیاری دەربارەی ئەم جۆرە دەنگە وای داناوە، کە (مەنتیق) پێویست بەوە دەکات، کە ئەگەر پیتێك دوو دەنگ، یان زیاتری هەبوو، بە چوکڵە، یان بە نیشانە، لە یەك جیابکرێنەوە، نەك بە دوو جار بنووسرێنەوە.[12]

ئەمەی (کۆڕ) بۆی چووە وادییە، چونکە نووسەرانی کورد لە زۆر دەمێکەوە لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون، کە بۆ دەنگی نیشانەی سەری عەرەبی (فتحە)، پیتی (ە) بەکاربهێنن، وە بۆ دەنگی نیشانەی ژێری عەرەبی (الکسرة)، پیتی (ی) بەکاربهێنن، وە بۆ دەنگی نیشانەی بۆری عەرەبی (الظمە) واوێك بەکاربهێنن.

بەپێی ئەم دەستوورە هەموو واوێکی بۆردار لە جیاتی بۆرەکەی واوێکی تری لەگەڵا ئەنووسرێت.

ئەگینا ئەگەر ئەمە نەکرایە باشتر وا ئەبوو کە هەر نیشانەی بۆری عەرەبییەکە بهێڵرایەوە. بەوە وشەکان زووترو ئاسانتر ئەخوێنرانەوە لەوەی کە وەك ئێستا (کۆڕ) لەسەری سوورە، کە نیشانەی سەرێکی (فەتحەیەکی) عەرەبی لەسەر واوەکە دابنرێت، تاکو واوەکە بە بۆردار بخوێنرێتەوە... بە جۆرێك کە خوێنەر لەو ووشانەدا دەنگی سەری عەرەبی (فەتحە)ی لە بیر بچێتەوەو، ئەو سەرە بە بۆر بخوێنێتەوە..! بە پێچەوانەی ئەو دەستوورەی کە ئەڵێت: ئەو پیتانە، یان ئەو نیشانانەی لە شێوەیانا چون یەکن، ئەبێت لە دەنگیشیانا لەیەك بچن.

**٥-لامی قەڵەو:**

کارێکی بەجێیە، کە وەك ئێستا پەیرەوی ئەکرێت، ئەم جۆرە لامە کڵاوێکی لەسەر دابنرێت، بەڵام بۆ مەبەستی چاپ کردن، باشتر وایە، کڵاوەکەی لەناو بۆشاییەکەیدا بێ لە جیاتی ئەوەی لەسەر پۆپەی لامەکە دابنرێت بەو جۆرەی ئێستا پەیرەوی ئەکرێت، وەك: (ڵ، ڵ).

**٦-(ی)ی درێژ:**

بۆ ئاسان کردنی خوێندنەوەو نووسین، وە کەم کردنەوەی رامان و سەرلێ شێوانی خوێنەر، باشتر وایە کە (ی)ی درێژ هەر

---

11 محمد محمود رضوان، تعليم القراءة للمبتدئين، القاهرة: مكتبة مصر، ١٩٥٨، ص (١٩٦).

12 کۆڕی زانیاری کورد، نامیلکەی ڕێنووسی کوردی، بەغداد: چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦، لاپەڕە (٦).

وەك خۆی بنووسرێت، بێ ئەوەی هیچ نیشانەی (سەر) ی لەسەر دابنرێت وەك ئەوەی ئێستا (كۆڕی زانیاری) لەسەری ئەڕوات، كە بۆتە هۆی گیروگرفتێكی زۆر بۆ خوێنەری كورد.

بەگوێرەی ئەو دەستوورەی كۆڕ دایناوە، ئێمە ئەبێت لە خوێندنەوەی نووسراوی كوردیدا نیشانەی (سەر) ی عەرەبی بە (ژێر) بخوێنینەوە، وە لەبیرمان بچێتەوە كە دەنگی ئەو (كسرە) لە عەرەبیدا دەنگی (ژێرە).

ئەمەش كارێكی ئاسان نییە بۆ ئەو خوێنەرەی كە لە سەرەتادا بە كوردی فێری خوێندنەوە و نووسین ئەبێت و، ئنجا ئەچێتە سەر فێربوونی خوێندنەوەو نووسینی عەرەبی، یان بە پێچەوانەی ئەوە، بە عەرەبی دەست پێ ئەكات ئنجا ئەچێتە سەر كوردی، كە شێوەی سەری عەرەبی (فەتحە) جارێك لە وشەی عەرەبیدا بە (سەر) بخوێنێتەوە، جارجاریش لە وشەی عەرەبیدا بە (سەر) بخوێنێتەوە، جارجاریش لە وشەی كوردیدا بە (ژێر) بخوێنێـوە، بێ گومان بەمە تووشی گەلێك چەواشە بوون و سەر لێ شێوان ئەبێت، وە وای لێدێت، كە وەك لە پێشەوە باسمان كرد، هەموو وشەیەك، دوای ڕامان، بە پچڕ پچڕی و خاوی بخوێنێتەوەو، نەتوانێت بێن لە خوێندنەوەوە بگرێت. لە گەلێك زمانا زۆر لە پیتەكانی هەریەكەیان گەلێك دەنگی جیاوازیان هەیە وە ئەم جیاوازی یە بە پێی واتای وشەكان لە ناو ڕستا بە ئاسانی دەرئەكەوێت پێ ئەزانرێت.

**٧-پیتی "چ":**

زۆر جار لە نووسینی كوردیدا پیتی "چ" بەكار ئەهێنرێت بۆ گەلێك مەبەست وەك ئەمانە:

-بۆ پرسیار وەك: (تۆ چ كارەیت؟)

بۆ پرسیار لە جیاتی "چی" وەك: (تۆ چ دەڵێیت؟)

-بۆ سەرسام بوون (تعجب) وەك: (ئەمە چ بلیمەتێكە!)

-بۆ وەك یەك بوون، وەك: (چ ئەم چ ئەو). كۆڕی زانیاری بڕوایوایە ئەم پیتە هەر بە ڕووتی، بەتەنیا بنووسرێت.[13]

ئەم بڕوایە لەسەر بنچینەیەكی ڕاست نییە، چونكە لەزمانی كوردی دا وەك گەلێك لە زمانەكانی تری وەك: عەرەبی و ئینگلیزی هیچ پیتێكی كونسونانت consonant (بێ دەنگ) بە تەنیا ئاخاوتن ناكرێت، لەگەڵ پیتێكی ترا نەبێت. لەبەر ئەوە كارێكی بەجێ نییە ئەگەر ئێمە پیتی (چ) بە تەنیا بەكار بهێنین بۆ ئەو جۆرە مەبەستانەی باسمان كردن. بەڵكو وا چاكە، كە پیتی (ە) ی لەگەڵا بنووسین كە بە نیمچە دەنگێك لەگەڵیا بخوێنرێتەوە، وەك: (چە ئێمە، چە ئێوە).

**٨-شێوەی نووسینی پێشگرەكان:**

لە كوردیدا هەندێك پێشگر هەن لە وشەدا، بۆ ئاسان كردنی خوێندنەوەو نووسین، واچاكترە كە بە پێوەلكێنراوی بنووسرێن، وەك: (پێكەنین، تێپەڕبوون، تێگەشتن، تێكڕا، پێوەبوون، لێدان، لێنان،..)

بەڵام هەندێكی تر هەن لەو پێشگرانە، كە بۆ ئاسانكردنی خوێندنەوەو نووسین، وا باشترە لە وشەدا بە پێوەلكێنراوی نەنووسرێن، واتا لە وشەكەدا بە جیا بنووسرێن، وەك: (لێكۆڵینەوە، لێپرسین، لێ وەڕەس بوون، پێك هێنان، ژن هێنان، تێ بینی، لێ هاتن، پێ ئەگات، تێ ئەگات، پێ ویست، بێ گومان، جێ هێشتن، لێ وەشاوە..).

كارێكی زۆر پێویستە، كە كۆڕی زانیاری لیژنەیەك دابنێت كەبووروو درێژ، فراوان و قووڵ، لەم بابەتە بكۆڵێتەوەو، ئەو پێشگرانە دەست نیشان بكات كە ئەبێت بە پێوەلكێنراوی، لە ناو وشەدا بنووسرێن، لەگەڵ ئەو پێشگرانەدا كە وا چاكترە لە ناو وشەدا بە جیا بنووسرێن.

وە ئەو باسەی كە لە بەرگی پێنجەمی گۆڤاری كۆڕی زانیاری كوردا لە ساڵی ١٩٧٧ دا دەربارەی (ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی) بڵاوكراوەتەوە[14]، سەرەتایەكی بەجێیە بۆ دەست پێكردنی ئەم ئەركە.

**٩-بڕگەی (یە) لەدوای پیتی (ی):**

بۆ ئاسانی خوێندنەوە، وا چاكە ئەگەر بڕگەی (یە) بەدوای پیتی (ی)ی درێژدا، یان بە دوای پیتی (ێ)ی كراوەدا هات، لە پاڵیا بنووسرێت، بێ ئەوەی پێوە بلكێنرێت، وەك: (ئەم دێیە، لێرە ذییە، ئەم شارە سلێمانیە، ئەم كاذییە،..)

**١٠-پیتی (ی) لە كۆتایی وشەدا:**

ئەگەر (ی)ی ئیزافە، یان وەصف هاتە سەر ئەو وشانەی كە كۆتاییان بە (ێ)ی كراوە، یان بە (ی) درێژ دێت، بۆ ئاسان كردنی خوێندنەوەو نووسین، باشتر وایە، كە ئەو (ی)یە لە كۆتایی وشەكەدا، بێ پێوە لكاندن بنووسرێت، وەك: (ترێی سپی، كانیی ئەو دێیە) نەك وەك كۆڕی زانیاری دایناوە، كە ئەو

---

[13] كۆڕی زانیاری كورد – سەرچاوی پێشوو (١١) – لاپەڕە (٨).

[14] كۆڕی زانیاری كورد، ڕێزمانی ئاخاوتنی كوردی، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی پێنجەم، بەغداد، كۆڕی زانیاری كورد،١٩٧٧، لاپەڕە (٣٤٣-٤٢١).

(ی)یە لە شێوەی یەکەما بلکێنرێت بە وشەکەوە، وە لە شێوەی دووەما نەنووسرێت[15].

١١-ڕاست کردنەوەی هەندێك شێوەی تر لە ڕێنووسی کوردیدا:

| چەوت | ڕاست |
|---|---|
| ڕادەیێکی | ڕادەیەکی |
| ژمارەیێکی | ژمارەیەکی |
| کابرایێکی | کابرایەکی |
| تێیاندا | تێ یاندا |
| کێیە | کێ‌یە |
| زماننناسی | زمان ناسی |
| ئەم ڕاستییەیان | ئەم ڕاستی‌یەیان |
| سێیەم | سێ‌یەم |

**١٢-پەسەندکردنی چەند بەشێك لە بیرو باوەڕەکانی کۆڕی زانیاری کورد:**

بیرو باوەڕەکانی کۆڕی زانیاری کورد دەربارەی شێوەی نووسینی ئەمانەی خوارەوە بەجێ‌یەو پێویستە پەیرەوی بکرێت:

-وشەی ناوی بێگانە.
-وشەی داتاشراو.
-وشەی (ئەم).
-وشەی گۆڕراو.
-نووسینی فیعل لەگەڵ ئامرازی پێش خۆیدا.
-نووسینی ناو.
-وشەی یەك واتا بەخش.
-نووسینی ئاوەڵناوی وەك: تر، کە...
-ئامرازی (تفضیل).
-ئامرازی (دا) وە (را).[16]


سەرچاوەکان:

١- Encyclopedia Britannica 15th ed. 1974 Ed. Chicaqo, Encyclopedia Britannica, 1974- Vol. 1 pp. 618-624.

٢- Ibid (1) pp. 618-622.

٣-حامید فەرەج، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکا، بەغداد: کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦، لاپەڕە٥-٦.

٤- Edward B. Fry, Elementary Reading Instruction, New York: McGraw – Hill Book Co. 1977. P. 4.

٥- Anonynous, Perspectives on Elementary Reading, Edited by Robert Karlin, New York : Harcoaurt Brace govanovich, Inc, 1973. P. 317.

٦- Wiliam S. Gray, The Teaching of Reading and Writing, Switzerland, UNESCO,1956. pp. 45-49.

٧- Anderson, Pavl S, Language Skills in Elementary Education, Second edition, New York : Macmillan publishing Co. Inc. 1972. pp. 171-206.

٨- Deboer, gohn g. and Dallmann, Martha, The Teaching of Reading New York : Henry Holt and Company, 1960. pp. 25,26.

٩-دکتۆر جمال نەبەز، زمانی یەکگرتووی کوردی، ئەڵمانیا - بەرلین ١٩٧٦، لاپەڕە ٧٨-٩٠.

١٠-محمد محمود رظوان، تعليم القراءة للمبتدئين، القاهرة: مكتبة مصر، ١٩٥٨، ص ١٩٦.

١١-کۆڕی زانیاری کورد، نامیلکەی ڕێنووسی کوردی، بەغداد: چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٦، لاپەڕە ٦.

١٢-کۆڕی زانیاری کورد-سەرچاوی پێشوو (١١) لاپەڕە ٨.

١٣-کۆڕی زانیاری کورد، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی پێنجەم. بەغداد-کۆڕی زانیاری کورد، ١٩٧٧، لاپەڕە ٣٤٣-٤٢١.

١٤-کۆڕی زانیاری، سەرچاوەی پێشوو (١١) لاپەڕە ١٦.

١٥-کۆڕی زانیاری. سەرچاوەی پێشوو (١١) لاپەڕە ٩-١٧.


* * *

[15] کۆڕی زانیاری، سەرچاوەی پێشوو (١١)، لاپەڕە (١٦).

[16] کۆڕی زانیاری، سەرچاوەی پێشوو(١١)، لاپەڕە ٩-١٨.

# خۆئامادەکردن بۆ خوێندنەوەو نوسین

ن : إبراهيم أمين بالدار
وەرگێڕانی : ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد

داوسن دەڵێ: مندالْ کە تەمەنی دەگاتە شەش سالْ کاتی چونە پۆلی یەکەمیەتی لە قۆناغی سەرەتایی، دەتوانێت نزیکەی ((٢٥٠٠)) وشە قسە پێبکات و بەکاربهێنن لە هەمان کاتدا نزیکەی ((.../١٧))، وشە تێدەگات.

**عوامل الإستعداد : هۆکارەکانی ئامادەکردن :-**

کاتێك دەڵێین مندالْ ئامادەیە بۆ ئەوەی دەست بکەین بە خوێندنەوەو نوسین مەبەستمان ئەوەنییە کە توانای بەهێزی هەیە بۆ فێربوونی خوێندنەوەو نووسین و هەموو شتێ لەیەککاتدا، بەڵکو ئامادەیە بۆ دەست پێکردن بە خوێندنەوەو نووسین هەنگاو دوای هەنگاو. ئەم ئامادە سازییەش پەیوەندی تەنها بە گەشەی مێشکەوە نییە (العقلی) بەڵکو کارتێکەری تر هەیە کە یارمەتی ئامادەکردن دەدات وەك:

ئامادەبوونی لاشەیی، کۆمەڵایەتی، هەڵچون، زمانەوانی، سوود وەرگرتن لە ژیان، هەنگاوی وتنەوەی وانە، گەڵێ شتی تر کە بەکورتی لە بارەیانەوە دەدوێین. ((إستعداد الجسمي، الإجتماعي، إنفعالي، اللغوي، خبرات الحياتية، خطوط طرائق تدريس،...))

١-هۆکاری هزرو مێشك -العقلي-: مندالأن جیاوازن لە بیرو هۆشیاندا چۆن جیاوازن لە بالأو ڕەنگ و شێوەیاندا، وە لە زیرەکییاندا هەر جیاوازن.

٢-هۆکاری لاشەیی ((العامل الجسماني)): ئەم بەشانە دەگرێتەوە:-

| | |
|---|---|
| أ/أهمية الحركة | گرنگی جوڵە |
| ب/سيطرة على حركة اليد | زاڵبون بەسەر جوڵەی دەستدا. |
| ج/أهمية النظر | گرنگی سەیرکردن |
| د/تميز البصر | جیاوازکاری چاو |
| ه/اهمية السمع | گرنگێتی بیستن |
| و/التميز السمع | جیاوازکاری بیستن |
| ع/الصحة العامة | تەندروستی گشتی |

کرداری فێرکردن، بەتایبەتی ((خوێندنەوەو نووسین)) پێویستی بە (لاشەیەکی ڕێکوپێکی گەشەکردو هەیە، چاو، گوێ، تەندروستی، جوڵەی ماسولکەکان، بەکارهێنانی دەست بۆ پەڕە هەڵدانەوەو پێنوس گرتن، زمان پاراوی...

أ/گرنگێتی جوڵە:-

قوتابی دەبێت ((٦)) ساڵی تەواو کردبێت، توانایەکی باشی هەبێت بۆ جوڵە و یاری کردن، قوتابی لاشەی لەیەك ئاستدا ناوەستێت هەروەها چێژ لە ڕاکردن، بازدان، پێکەنین، ڕاکێشان، پاڵنان وەردەگرێت، ناتوانێت زاڵبێت بەسەر جوڵەی دەست و قاچیدا.. گەر بۆ ماوەیەك دانیشاند، نەتهێشت بجوڵێت ئەوا هەست بە هیلاکی و بێزاری و دڵەڕاوکێ دەکات و لەوبار ودۆخە هەڵدێت.

*لەم تەمەنەدا ((٢-٣)) کاتژمێر ئارەزووی یاری کردن دەکات لە هەوای کراوەدا.

*لەم تەمەنەدا ئارەزووی یاری کردن دەکات لە تاقم و گروپ و کومەڵی خۆی بێگوێدانە رەگەزی جیاواز لە خۆی. پێویستە کەش و کاتی بۆ برەخسێ.

*ئەم یاری و گاڵتەو گەپانە دەبێت ئازاردان و هەست بریندارکردنی تیا نەبێت و بۆ داهاتووی سودمەند بێت-چ لە ماڵ-چ لە قوتابخانە-.

*نابێت جل و بەرگی تەسك و توند و قورس بێت، پێلاوی پێی و جێگاکەی تەسك و توند نەبێت.

*کورسییەکەی زۆر بەرز نەبێت و بەرزی لەگەڵ بالآیدا بگونجێ پۆلی (١-٣) بەرزی نزیکەی ١٤ بوصە-ئینج

پانی نزیکەی ١٠-١٢=/گەر دوو کەسی بوو:-٤٨بوصە درێژی

١٨ بوصە پانی ٢٤ بوصە بەرزی

*قوتابی ئەم قۆناغە ناتوانێت ماوەیەکی زۆر گوێ لێبگرێت ((٥-١٠)) خولەك ورياكردنەوەیەکی دەوێت، تا تۆزێك بەتەوە سەر خۆی.

*پێویستە وانەکەت بە زەوق و شەوق بکەیت بە چەندین چالاکی و گۆرانی و سرود.

*پێویستە سنگ فراوان بیت، چونکە قوتابیان هەندێ جوڵە دەکەن دەبێت گوێی ی پێنەدەیت و سادە بیت.

ب/زاڵبون بەسەر جوڵەی دەست دا:-

یەکێکە لە هۆکارە بنەرەتییەکان لە ئامادەکردنی منداڵ بۆ نووسین وەك ((پێنووس گرتن، لاپەرە هەڵدانەوە)).

گەر جوڵەی ماسولکەی دەست تەواو گەشەی نەکردبێ بۆ پرۆسەی نووسین سودمەند نابێ و دوادەکەوێت.

پێویستە چەند چالاکییەکی زیادی پێبکرێت تاباش دەبێت وەك:

((بەکارهێنانی مەقەست، چەکوش و یاری بە میکانۆ، برینی وێنەو پیالکاندنی بە لاپەرەدا بە پێنوس بەسەر خەت و خاڵدا بروات و وێنەیان بکات و رەنگیان بکات.

*دەبێت پێنوس بە توندی و رەقی نەگرێت و لاپەرەکان باش بەکاربهێنێ و لە کاتی سرینەوەدا نەیدرێت، دەستی راست بەکاربهێنێ لەکاتی نوسیندا.

*گەر دەستی چەپی بوو یا هەردوو دەستی بەکاردەهانی پێویستە:-

أ/چاودێری بکەین بزانین کام دەستی زیاتر بەکاردەهێنێ لەکاتی کاری تردا تا لەسەر ئەو دەستەی کار بکات.

ب/ئاگاداری (باوکی یا دایکی) بکرێت کە ((چەپلەرە) زۆری لێنەکرێت بۆ راستە.

٦٪ منداڵان بە دەستی چەپ دەنووسن.

٣-گرنگی بینین (چاو):-منداڵ لەسەرەتای هاتنە قوتابخانەی چاوەکانی بەتەواوی گەشەیان نەکردووە، توانای کارپێکردنی کەمە، لەبەر ئەوە پێویستە ماوەی نوسین، یا خوێندنەوە کەم بێت و قوتابی بێتوانا نەبێت و نوسینەکان گەورەو شاش بن، داوا بکرێت کە چەند جارێ چاوەکانیان بکەنەوەو دایبخەنەوە، تا توشی چاو یەشەو فرمێسك تێزان نەبێ.

*هەندێك لە قوتابیان دوور بینن یا نزیك دەبینن، دەبێت ئاگاداریان بکەین و پیشان پزیشکی چاو بدرێن، دەبێ تەختەرەش پانییەکەی (٣٦-٤٨) ئینج بێت، بەرزی (٢٤)ئینج بێت، نووسینی مامۆستاش دەبێت (گەورەو باش و رێك و پێك بێت و تێکەڵ و پێکەڵ نەبێت، ریزەکانی کورت بێت، تا قوتابیان بەباشی و دوور لەبێزاری کات بەسەر ببەن لەپۆلدا ئەو پۆلەش نابێت:

أ/پەنجەرەی لە پێش و پاشی پۆل هەبێت چونکە قوتابیان چاویان هیلاك دەبێت و دەبێتە هۆی بریقەدانەوەی تەختە رەشەکەش و ئیتر قوتابیان پیت و وشەکان تێکەڵ دەکەن.

ب/دیوارەکانی سادەبن و بۆیەکراوو جوان بن. تاریك نەبن، پەنجەرەکانی بەسەر تەنیشتەوەبێت و بچوك نەبن.

ج/روناکی بەهێز یا بێهێز و نزیك لە پۆلدا نەبێت تا قوتابیان چاوو بیریان هیلاك نەبێت و سەریەشە نەگرن. دەبێت ئەو روناکیە سروشتی بێت. گەر تەلەفزیۆن لە هۆڵی قوتابخانە هەبوو دەبێت رەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:

أ/لە ئاستی چاویاندا بێت واتە نەزۆر بەرز و نەزۆر نزم.

ب/ ٣-٤ م یا ٣-٤ ئەوەندەی گەورەی تەلەفزیۆنەکە دوور بن لێوەی.

ج/ زوو زوو چاو بتروکێنن لە شاشەکە.

د/ دەبێت پەنجەرە روی تێنەبێت.

٤-التميز البصری: خوێندنەوە کردارێکی بیرو هزرییە "العقلیە" داوای دەرهێنانی واتاکەی دەکات لە وشە نووسراوەکان، ئەم وشە نووسراوانەش تەنها هێمان کە گوزارشت لە بیرو شتەکان دەکەن. چاویش کەرەسەی هەست پێکردنیەتی.

پێویستە چەند یاری و ڕاهێنانێکی کەم کەم بدرێتە قوتابی تا توانای چاوی بەهێز دەبێت بۆ جیاکردنەوەی شتەکان و ناسینەوەیان.

٥-گرنگی بیستن: پێویستە قوتابی توانای بیستنی تەواو بێت تا لە داهاتوودا توانای بیستنی دەنگی مامۆستا و قوتابیانی لا باش بێت و تێکەڵ و پێکەڵی نەکات.

گەر هەست کرا قوتابی گوێیگرانە لەم قۆناغەدا:

أ/ دایك و باوكی ئاگادار بكرێن.

ب/پیشانی پزیشكی شارەزا بدرێت و چارەسەر بكرێت.

ج/ مامۆستاش چاودێری بكات و دەبێت:

١-دەنگی مامۆستاش لەسەر خۆو نەرم و هێمن بێت.

٢-قسەكانی دیار و ڕوون بێت.

٣-زمانی نەیگرێت و پرتە پرت نەكات........

٤-یا لە ناوەڕاستی پۆل یا لەپێشەوە دایبنیشێنێ...

٦-التمیز السمعی: هۆیەكی ترە كە یارمەتییان دەدات بۆ ئامادەكردنی قوتابی بۆ خوێندنەوە. لەو دەورووبەرەی تێیدا دەژی چەند دەنگ بەر گوێی دەكەوێت و لێكیشیان جیادەكاتەوە و دەیان ناسێتەوە. وەك: دەنگی با، سەیارە، بولبول و كەسانی دەورووبەری...

كچان توانایان باشترە بۆ جیاكردنەوەو ناسینەوەی دەنگەكان وەك لە كوڕان.

پێویستە قوتابیان لەسەرەتاوە ڕابهێنین لەسەر دەنگەكان و لاسایی كردنەوەیان و گوێ گرتنیان لە دەنگی سرود و گۆرانی و تەلەفزیۆن...)

ڕۆژانە ماوەیەكی كەم لە سەرەتاوە دەنگی گیانلەبەران بە قوتابیان بوترێت و لاساییان بكاتەوە. تا لە داهاتودا دەنگی پیت و وشەكان لەیەكتر جیابكاتەوەو بشتوانێت كاریان لەسەر بكات.

٧-تەندروستی گشتی:-

لەسەرەتاوە تەندروستی گشتی منداڵ ڕۆڵێكی سەرەكی دەبینێت لە پێشكەوتن یا دواكەوتن لە خوێندن بە تایبەتی خوێندنەوەو نوسین و ئەم دوانە پێویستی زۆری بە توانای باش و ورد بینی و وریایی و سەرنج دان هەیە.

گەر نەخۆشی لاشەیی یا دەرونی هەبێت دەبێتە هۆی دواكەوتن لەو قۆناغەدا.

منداڵان پێویستە (١١-١٢) كاتژمێر بنوێ پاش نیوەڕوانیش چەند كاتێ منداڵان دەبێت هەندێ گاڵتە و یاری جوڵە بكەن.

گەر منداڵی وەك پێویست نەبوو دەبێت پیشانی دكتۆر بدرێ و چارەسەر بكرێت.

پێویستە پۆلەكان بۆنخۆش و هەوای پاكی تیا بێ نەك (تەپوتۆز و بۆنی دوكەڵ و داخستنی دەرگا تا تەواوبوونی وانە....

پێویستە مامۆستای دڵسۆز ئاگاداری ئەم كارانە بێت.

العامل الإجتماعی:((هۆكاری كۆمەڵایەتی)):-قوتابی لە ماڵەوە دێتە قوتابخانەو هەست بە ناخێكی شڵەژاو دەكات.. وا هەست دەكات كە بە تەنهایە..

یەكەم جارە پشت بە خۆی دەبەستێ.. بەڵام دوای تێپەڕینی چەند ڕۆژێ هۆگری قوتابخانەو مامۆستاو قوتابیان دەبێت.

ئەمەش بە چەند یاری و هاوكارییەك و ڕاهاتن بۆ گوێگرتن و هاوكاری هاوڕێكانی و شارەزا بوونی خۆی لە چ دەورووبەرێكدایە.

**مامۆستای شارەزاو دڵسۆز بە چەندین:-**

أ-چیرۆك ب/یاری تۆپ ج/سەردانی باخچەو دەورووبەر د/دابەش بوون بۆ كۆمەڵ و گروپ و دانی كاری ئاسان بۆ ئەنجامدانیان...

زاناكان دەڵێن:

لە شیر برینەوە دەچێت بۆیە ناونراوە (لەشیر برینەوەی دووەم) (الرضاعە الثانیە)

**تێبینی:**

**ئەم بابەتە وەرگێردراوی بەشێكی كتێبی (استعداد للقراءة والكتابة) كە مامۆستا باڵدار بە عەرەبی نوسیویەتی.**

٥–جعل الطفل يعي العلاقة بين لغة الحديث و الكتابة من خلال فعاليات متنوعة، كقيام المعلم باختيار قصص ممتعة محببة الأطفال يقوم بقراءتها لهم داخل الصف.

٦–جعل الطفل يدرك أن مايقوله يمكن كتابته. وذلك عن طريق قيام المعلم بكتابة مايريد منه الأطفال كتابته على السبورة، أو على لوحات ورقية كبيرة، بكتابة بارزة، وواضحة، ومبسطة، مثل: اسمائهم، وخبراتهم اليومية، وعناوين للرسوم التي يقومون برسمها، أو عبارات تحية، أو تهنئه، أو دعوة لأصدقائهم وأقربائهم، والقصص القصيرة التي يروونها، والمنظومات التي يبتكرونها. إن مثل هذه الفعاليات يمكن أن تخلق لديهم دوافع قوية لتعلم الكتابة، وتشجعهم على محاكاة المعلم في طريقة كتابته.

٧–إعانة الأطفال على إدراك فكرة التسلسل في القصص، عن طريق قيام الطفل بترتيب صور في تسلسل تروي قصة معينة، أو رسم مجموعة من الصور المتسلسلة التي تحكي قصة أو تصف عملية، وتمثيل بعض القصص المألوفة.

٨–إعانة الأطفال على تمييز الفروق بين الأصوات، من خلال الأستماع الى تسجيلات للتدرب على تميز اصوات مألوفة، والأستماع الى قصص تستخدم طريقة الأصوات المكررة، والقيام بألعاب مصاحبة للموسيقى ، وتمثيل قصص مع مؤثرات موسيقية و أمثال ذلك.

٩–من أهم خطوات الإعداد للكتابة أن نساعد الطفل على التعود على مسكة القلم و تحريكه بطريقة صحيحة، بحيث يمسك القلم بين الإبهام من الجانب الأيسر و السبابة بزاوية منفرجة في الجانب الأيمن فوق القلم، و الوسطى تحت القلم، و اسفلها البنصر، ثم الخنصر فوق الورق.

ويكون بعد رأس القلم عن نهاية السبابة حوالي بوصة واحدة على الأقل. كما يجب أن نعوده على الجلوس على كرسية بإعتدال. بحيث يكون وركه على المعقد مدفوعا الى الخلف، وهو يواجه منضدة الكتابة باستقامة، و رجلاه منبسطان فوق الأرضية، و الساعد الذي يستعمله في الكتابة يمتد برفق و راحة حتى يستطيع تحريكه مع الأصابع التي تمسك بالقلم بحرية و سهولة.

ويجب جلب نظر الطفل الى ضرورة تجنب الشد على القلم و مسكه بقوة، و تعويده على تحريك القلم بخفة و لطف و سهولة. ويجب على المعلم تهيئة تدريبات عديدة و موجهه في هذا المجال، و أن لا ينتظر من الأطفال جميعهم لاكتساب هذه المهارات بسرعة واحدة. وعليه مساعدة من يبطئ منهم بكل صبر و أناة، دون لوم، أو تعنيف، أو تعبير، و تشجيع أي تحسن يبدونه في مسكة القلم بصدق و حرارة.

١٠–إن تغيرات كبيرة في نمو و تطور التوافقات الحركية الأساسية تحدث لدى الطفل خلال السنة الأولى من دراسته، وهذه التغييرات تحدث بدرجات متفاوتة بين طفل و آخر، وكلما أزداد التوافق بين اليد و الزراع، و بين العين و اليد، قل التوتر لدى الطفل، وتناقص ضغطه على القلم، و صغر حجم كتابته. و من الحكمة أن لايشجع الطفل على زيادة مطردة في تناقص حجم كتابته.

١١–من المستحسن أن يبدأ الطفل بالرسم و التخطيطات على السبورة باستعمال قطعة متوسطة الحجم من الطباشير اللين، و الانتقال من ذلك الى استعمال الفرشاة للرسم على أوراق كبيرة. ثم بعد ذلك يجرى التحول الى استخدام القلم الشمعي (الكرايون) أو الماجيك العريض للرسم على أوراق كبيرة مثبتة على منصات الرسم، أو موضوعة على المنضدة. وبعد هذه الخطوات يمكن التحول الى استعمال القلم ذي السن أو الرأس العريض للرسم و التخطيط على أوراق عريضة غير مخططة بحجم (١٢*١٨) بوصة التي تساعده على تحريك عضلات يده الكبيرة، لأن الأوراق الصغيرة تحصر الطفل و تلجؤه الى استخدام عضلاته الصغيرة مما يؤدي به الى التعب السريع و الشعور بالفشل. و بما أن التوافق بين العين و اليد في هذا العمر ما يزال في طور النمو، قد يحول قيامه باستعمال الأوراق المخططة دون انطلاقه في الكتابة بحرية وسهولة و ثقة.

١٢–هناك في كل صنف نسبة غير قليلة من الأطفال يستعملون في الكتابة و الفعاليات الأخرى يدهم اليسرى، فالطفل (الأعسر) الذي يفضل استعمال يده اليسرى في الكتابة بحاجة الى منضدة ملائمة يكتب عليها، و يقتضي أن يميل الورقة التي يكتب عليها بمقدار (٣٠) درجة الى الجهة اليمنى، و يبعد رأس القلم عن ابهامه بمسافة أكثر مما يفعله من يكتب بيده اليمنى.

أما الطفل الذي يستعمل يده اليمنى في الكتابة، فيحسن أن يدير الورقة التي يكتب عليها قليلا الى الجهة اليسرى.

المصدر:

استعداد للقراءة والكتابة، تأليف ابراهيم امين بالدار، طبعة الاولى ١٩٨٤، اربيل

# هەڵسەنگاندنێکی سایکۆلۆژییانەی ئەلف و بێی کوردی

کەریم شەریف قەرەچەتانی
کۆلێژی پەروەردە-زانکۆی سەلاحەدین

پێشەکی:

نووسین بۆ منداڵ کارێکی ئاسان نییە و هەموو کەس ناتوانێت خۆی لە قەرەی بدات، نەخوازەلا ئەو کارەش بۆ پەروەردەو فێرکردنی نەوە لەدوای نەوەی منداڵانی کورد بێت و یەکێك بێت لە کتێبە بنەرەتی و سەرەکییەکانی خوێندنی قۆناغی سەرەتایی. کتێبی ئەلف و بێی کوردیی مامۆستای خوالێخۆشبوو (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) یەکێکە لەو کتێبە کوردییانەی کە تا ئەمرۆ زۆرترین ژمارەی لێ چاپکراوەو زۆرترین کەسیش لە خوێندەوارانی کورد (منداڵان) خوێندوویانەتەوەو لە ڕێگەیەوە فێری ئەلف و بێی کوردی بوون و ئاشنایەتییان لەگەڵ زمانی شیرینی کوردی پەیدا کردووە، هەر لەبەر ئەوەشە کە ئێمەی کورد هەمووومان قەرزداری مامۆستای خوالێخۆشبوو مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)ین، چونکە لە ڕێگەی کتێبە بەنرخەکەی ئەوەوە زمانمان پڕاو فێری زمانی نووسینی کوردی بووین، بەبڕوای من کتێبی ئەلف و بێی کوردی لەهەموو ئەو کتێبە کوردییانەی تر کە بۆ منداڵ نووسراون سەرکەوتووترەو نزیك ترە لە جیهان و سایکۆلۆژیای منداڵ، ئەوەش بە پلەی یەکەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مامۆستای (بەهەشتی) خۆی پسپۆڕێکی شارەزاو کارامە بووە لەبواری



پەروەردەو دەروونزانی و بڕوانامەی بەرزی لەو بوارەدا هەبووەو توانیویەتی زۆر بە زیرەکانە بۆ نووسینی کتێبی ئەلف و بێی کوردیی پۆلی یەکەمی سەرەتایی سوودیان لێ وەربگرێ.

بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم کتێبە ئازیزو تاقانەیە بێ کەم و کورتی بێت، لەبەر ئەوەی هیچ مرۆڤێك نییە هەموو شتێك بزانێ، هەروەها زانستیش بەگشت بوارەکانییەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەبەرەوپێش چوون و گەشەکردندان. کەواتە لەو ڕوانگەیەوە دەبێت کتێبی ئەلف و بێی کوردیش هەندێك کەم و کورتیی بچووکی تێدابێت، چونکە ئەو کتێبە دەیەها ساڵە نووسراوەو زۆر بەکەمی دەستکاری کراوە، هەروەها شێوازو کەرەستەکانی ئەوکاتەی چاپکردن و وێنە کێشان و لایەنی هونەری وەك ئێستا پێش کەوتوو نەبوون، ئینجا ئەو تێبینیانەی ئێمە تەنیا بۆ دەوڵەمەند کردن و بەرەوپێش بردنی ئەو کتێبە بەنرخە، (نەك بۆ کەم کردنەوە لەنرخی) بۆ ئەوەی زیاتر سوودمە بەکەڵکتربێت بۆ پەروەردەکردنی منداڵانی کورد، ئەوەی ڕاستیش بێت کەم و کورتییەکان زیاتر تایبەتن بەلایەنی هونەرو شێوەو چاپکردن وەك لە ناوەڕۆك.

### سایکۆلۆژیای منداڵ

دەرئەنجامی سەرجەم توێژینەوە زانستییەکانی بواری سایکۆلۆژیای منداڵ ئەو قسەو قسەلۆکانەی پووچەڵ کردەوە کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە منداڵ پیاوێکی بچکۆلەیەو وەك گەورە وایە تەنیا بەجەستەو لەش ولار لە پیاو بچکۆلەترە. دەرکەوت کە جیهان و سایکۆلۆژیای منداڵ تایبەتمەندیەتیی خۆی هەیە و زۆر جیاوازە لە جیهان و سایکۆلۆژیای گەورەو هەرزەکاران، تەنانەت قۆناغی منداڵیش دابەش دەکرێت بەسەر چەند قۆناغێکی بچووکی تردا (قۆناغی شیرەخۆری، قۆناغی پێش چوونە قوتابخانە..تاد) کە هەریەك لەم قۆناغانەش تایبەتمەندیەتیی خۆی هەیەو لە زۆر لایەنەوە لە قۆناغەکانی تر جیاوازترە، لەبەرئەوە هەر کەسێك چیرۆك یان هۆنراوە یان پەراوێك بۆ منداڵ دەنووسێت دەبێت بزانێت بۆ چ قۆناغێکی دەنووسێ‌و چۆنی دەنووسێ و پێداویستی و گیروگرفت و تایبەتمەندییەکانی ئەو قۆناغە لەبەرچاو بگرێت، ئەگینا نووسینەکەی سوودبەخش نابێت و منداڵان هیچ گرنگیەکی پێ نادەن.

بەشێوەیەکی گشتی چەند پرانسیپ و پێوەرێك هەیە، دەبێت لەکاتی نووسین بۆ منداڵدا ڕەچاو بکرێن، چونکە تایبەتن بە قۆناغی منداڵی و دەبێت نووسینەکان لەسەریان بینا بکرێن، لە گرنگترینیشیان ئەمانەی لای خوارەوەن:-

١-بەپێی دەرئەنجامی تیۆرییەکی (جان پیاجێ)و سەرجەم لێکدانەوەکانی بواری گەشەکردنی عەقڵی منداڵ دەبێت هەموو نووسینەکان هەست پێکراو (محسوس)بن، لەبەرئەوەی تێگەیشتنی شتە هەست پێنەکراوو ڕووتەکان (الأشیاء المجردة) لە قۆناغی منداڵیدا زۆر زەحمەتەو تایبەتە بە قۆناغی هەرزەکاری.

٢-دەبێت وشەو زاراوەکان لە فەرهەنگی منداڵەوە وەرگیرابن و تایبەت بن بە جیهانی منداڵ.

٣-دەبێت چیرۆك و بەسەرهات و ڕووداوەکان نزیك بن لە جیهان و سایکۆلۆژیای منداڵ و پێیان ئاشنابن.

٤-دەبێت ناوەڕۆکی نووسینەکان لەڕێگەی وێنەو ئیگاری جۆراوجۆری سادەو ساکارەوە ڕوون بکرێنەوە.

٥-دەبێت نووسینەکان بە پیتی گەورەو شاش بنووسرێنەوە.

٦-تا منداڵ بچووك بێت دەبێت ئەوەندە نووسین و وێنەکان گەورەو پڕ وردەکاری و ئاسانکاری بن و دووربن لە ئاڵۆزی و تەم و مژاوی.

٧-دەبێت بابەتەکان بەپێی ئاسانی و گرانییان ڕیز بکرێن، واتە دەبێت لەسەرەتاوە بابەت و شتە ئاسانەکان دابنرێ دواتر بابەت و شتە قورسەکان ئینجا قورسترەکان.

٨-دەبێت لەسەرەتادا ڕستەو دەستەواژەکان زۆربەیان ناوبن دواتر کردارو ڕاناو..تاد.

٩-دەبێت وێنەکان ڕوون و ئاشکرابن و منداڵ بە ئاسانی تێیان بگات.

١٠-دەبێت ڕەچاوی جۆری کاغەزو پیت و بەرگ و لایەنی هونەری بکرێت و لەگەڵ سایکۆلۆژیای منداڵدا کۆك بن.

١١-دەبێت جۆری نووسینی وشەو ڕستەکان لەگەڵ ڕەزم و نەزمی ڕووداوەکان (ناوەڕۆك) بگونجێت، بۆ نموونە کاتێك نووسەر دەیەوێ باسی شێرێکی گەورە یان ڕێوییەکی بچکۆلە بکات، سەرکەوتووتر دەبێت ئەگەر ناوو وشەی شێرەکە بە گەورەیی بنووسێ و وشەی ڕێوییەکەش بە بچووکی، ئەو کاتە منداڵ لە مێشکی خۆیدا بەراورد لەنێوان مانای گەورەو وشەی گەورەدا دەکات و زیاتر لە مەبەستی نووسەر تێدەگات.

١٢-لەسەرەتای قۆناغی چوونە قوتابخانەدا منداڵ زۆر حەز بە دووبارە بوونەوەو وەسف کردن دەکات، بۆ نموونە ئەگەر

نووسەر گەرەکی بێت باسی شتێکی ترسناك بکات باشتر وایە زیاتر لەجارێك وشەی (ترسناك) دووبارە بکاتەوە هەروەها کاتێك باسی ئاژەڵ یان شوێنێك یان دارێك دەکات، پێویستە وەسفێکی تەواوی بکات وەك دارە گەورە بەرزەکە، یان کۆترە سپییە باڵ ڕەشەکە، یان خانووە قووڕە تاریکەکە...تاد.

## ئەلف و بێی کوردی

هەموومان دەزانین کتێبی ئەلف و بێی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی سەرەتایی نووسراوە، واتە منداڵ بۆ یەکەم جار دەچێتە قوتابخانەو زۆربەیان پێشتر هیچ کتێب و پەراوو گۆڤارێکیان نەخوێندووەتەوە، ناشزانن هیچ شتێك بخوێننەوەو بنووسن، کەواتە دەبێت لە کاتی نووسینی ئەم پەراوەدا ڕەچاوی زۆربەی ئەو خاڵانەی پێشتر کرابن، بەڵام ئەگەر وردبینانەو زانستییانە ئەم کتێبە بە نرخەی مامۆستای نەوەکان مامۆستا (ئیبراهیم باڵدار) هەڵبسەنگێنین، ئەم سەرنج و تێبینییانەی لای خوارەوەمان لەلا گەڵاڵە دەبێت:-

أ-ناوەڕۆك:-

لە ڕاستیدا کتێبی ئەلف و بێی کوردی تا ڕادەیەکی باش لە ناوەڕۆکیدا سەرکەوتووەو ڕەچاوی قۆناغی منداڵی کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك سەرنج و تێبینیم لەلا گەڵاڵە بووە، هیوادارم لە داهاتوودا وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان لەکاتی دووبارە چاپ کردنەوەیدا بەپێی توانا ڕەچاوی بکات، بۆ ئەوەی زیاتر خزمەت بە منداڵی کورد بکرێت.

١-بە داخەوە لە هەندێك شوێندا چەند وشەیەکی ڕووت و نامۆو تاڕادەیەك دوور لە فەرهەنگی زمانی منداڵ دزەی کردووەو خۆی خزاندووەتە نێو وشە هەست پێکراوەکانی تر، بۆ نموونە لە لاپەڕە (٢٠)و لەژێر بابەتی (زریزە) وشەی (زیوە) تا ڕادەیەك لەلای زۆربەی منداڵانی تەمەن (٦) ساڵ نامۆیەو نەیان بینیوەو بە زەحمەت لێی تێدەگەن، بەبڕوای ئێمە ئەگەر لەجیاتی ئەو وشەیە وشەیەکی تری وەك (سوور، زەرد، سپی) یان (درێژ، کورت) دابنرێت سەرکەوتووتر دەبێت.

٢-هەروەها لە لاپەڕە (٢٦) سێ جار وشەی (نایاب) دووبارە بووە کە ئەم وشەیە ڕووت و بێ مانایە (مجرد)و منداڵ لەو تەمەنەدا تێی ناگات، کەواتە باشتر وایە بکرێت بە وشەی (بەتام، خۆش، شیرین) واتە مێوژی (بەتام)یان (خۆش)یان (شیرین)یان مێوژی (ڕەش)یان (سوور)، کە ئەم وشانە منداڵی تەمەن شەش ساڵ تێی دەگەن.

٣-لە لاپەڕە (٢٧) (بەبەی زەینەب). وشەی (بەبە) لە زمانی کوردی و فەرهەنگی منداڵدا بۆ منداڵی بچکۆلەی مرۆڤ بەکاردێت و تەنانەت هەندێك جاریش بۆ خۆشەویستی و نازپێدانی منداڵ بەکاردێت بەڵام بە دەگمەن، بۆ بووکە شووشەو بووکە واڵاو یاری بەکاردێت کەچی لەو بابەتەدا (بەبە) بۆ شتێکی تر کە منداڵ نییە بەکار هاتووە، کەواتە لەجیاتی ئەو سێ جارەی کە (بەبە) دووبارە بووەتەوە دەتوانرێت وشەی (بووکە شووشە)یان (بووکەواڵا) بەکاربهێندرێت کەپڕ بەپێستی بابەتەکەیەو تایبەتە بەو قۆناغەی منداڵ.

٤-لەلاپەڕە (٣٠)دا سێ جار وشەی (تەیر)دووبارە بووەتەوە، بەبڕوای من ئەم وشەیە عەرەبییەو باشتر وایە لەجیاتی ئەوە وشەی (باڵندە) بەکاربهێندرێ.

٥-لەلاپەڕە (٣١) وشەی (دیت) بەکارهاتووە کە مەبەستی (سێوی ترە) کەواتە بۆ ئەوەی منداڵ سەری لێتێك نەچێ و وانەزانێ کە (دیت) مەبەستی (بینینە) باشتر وایە لەجیاتی (دیت) وشەی (ترت) دابنرێ.

٦-لەلاپەڕە (٣٢) وشەی (ئەوسا) بەکارهاتووە، ئاسانترو گونجاوترە لەجیاتی ئەو وشەیە وشەی (بەیەکەوە) دابنرێت واتە (ئەوسا دەڕۆین بۆ دەرەوە) دەبێت بە (بەیەکەوە دەڕۆین بۆ دەرەوە).

٧-لەلاپەڕە (٣٦) وشەی (تیپ) بەکارهاتووە، باشتر وایە لەجیاتی ئەوە (کۆمەڵ) دابنرێ واتە (دوو تیپ) دەبێت بە دوو کۆمەڵ) چونکە لەلایەك تیپ زەحمەت و گرانە بۆ منداڵی شەش ساڵ لەلایەکی تریشەوە زیاتر لەمانایەك دەگەیەنێ وەك (تیپی ئاوی) (لەزگە).

٨-لەلاپەڕە (٤٢) باسی هێلکەی زەردو سوور دەکرێت، بەڵام زیاتر ڕوون نەکراوەتەوە کە ئایا ڕەنگی کردووە یان هەر هێلکەی زەرد هەیە، کە باشتر وایە بکرێن بە هێلکەی سپی و سوور یان گەورەو بچووك بۆ منداڵ بە ئاسانی لێیان تێ بگات.

٩-هەر لەهەمان لاپەڕەدا (٤٢) سێ جار کرداری (دەهاوێژم، بیهاوێژە، نایهاوێژم) کە بەبڕوای من ئەمە گرانەو نامۆیە باشتروایە بکرێت بە کرداری (هەڵی دەدەم، هەڵی بدەی، هەڵی نادەم) چونکە زۆرتر بەکاردەهێنرێن و منداڵ بە ئاسانی لێیان تێدەگات.

١٠-لەلاپەڕە (٤٣) دووجار وشەی (ئاواز) بەکارهاتووە، کە منداڵ لە تەمەنی شەشساڵیدا بەهیچ شێوەیەك لەمانای (ئاواز) (لحن) تێ ناگات و پێویستی بە زانیاریی زۆر هەیە دەربارەی مۆسیقاو گۆرانی ئینجا لەدوا قۆناغی منداڵی ئەگەر تێی بگات کەواتە باشتر وایە بکرێت بە (بۆن) یان (گۆرانی) واتە (ئاوازی گوڵ) دەبێت بە (بۆنی گوڵ) یان (گۆرانیی گوڵ) کە منداڵ بە ئاسانی لەو تەمەنەدا تێی دەگات.

١١-لە لاپەڕە (٤٤) وشەی (تۆکڵەکەی) بەکارهاتووە، کە ئەمەش هەڵەی زمانەوانییەو ئەوەندەی من بزانم (توێکڵ) ڕاسترە و باشترە بۆ زمانی کوردی، هەروەها وشەی (نایاب) لێرەش دووبارەبووەتەوە باشتر وایە بکرێت بە (خۆش، شیرین) واتە (کاڵەکی نایاب) دەبێت بە (کاڵەکی خۆش یان شیرین). لەلایەکی تریشەوە توێکڵ خۆی فڕێ دەدرێت نەك توێکڵ پاك بکرێت، بەڵام بەداخەوە لە لاپەڕە (٤٤) نووسراوە (بەدایکت بڵێ بۆت لەت بکات و توێکڵەکەی باش پاك بکات) کە ئەمە لەلایەنی زمانەوانییەوە ڕاستتردەبوو ئەگەر بگوترایە (توێکڵەکەی لێ بکاتەوە). چونکە کاڵەکە پاك دەکرێت نەك توێکڵ پاك بکرێت، کە بێگومان ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی چەواشەکردنی منداڵ و سەرلێ تێکدانی.

١٢-لەلاپەڕە (٤٥) باوك بە نەسرینی کچی دەڵێ (وا کۆترو ڕیشۆڵەم بۆ تۆ هێناوە) کە بە بڕوای من ئەگەر لە جیاتی (ڕیشۆڵە) (کەو) یان (کەروێشك) یان (بولبول) بوایە باشتر بوو، چونکە ڕیشۆڵە نە ماڵی دەبێت و نەدەشخرێتە قەفەسەوەو نەئەوەندەش گۆشتی پێوەیە کە بخورێ، لەلایەکی تریشەوە زۆر زەحمەتە لەهیچ شارێك یان گوندێك یان کۆمەڵگایەك، لە کوردستان شتی وا ڕووبدات کە باوك ڕیشۆڵە بۆ منداڵی بهێنێتەوە ئەگەر ڕووش بدات زۆر دەگمەن و کەمە، کەواتە باشتر وایە نموونەکان لەو جۆرە بێت کە لەژینگەو واقعی منداڵدا هەیەو زۆر دووبارە دەبێتەوە.

هەر لەهەمان لاپەڕەدا وشەی (ناسکۆڵێ) بەکارهاتووە کە ئەمە ڕووت و بێ مانایە (مجرد)و منداڵ لە قۆناغی هەرزەکاری ئینجا تێی دەگات، کەواتە باشتر وایە بکرێت بە (کچی جوان) یان (عاقڵ) یان (کچی پاك) یان (کچی زیرەك) چونکە منداڵ بە ئاسانی تێی دەگات. هەروەها هەر لەم لاپەڕەیەدا (٤٥) وشەی (نانەڕەق) بەکارهاتووە بەبڕوای من (نانی نەرم) بوایە گونجاو تر بوو چونکە دوور نییە زۆر لە منداڵان بڵێن چۆن کۆتر و ڕیشۆڵە نانە ڕەق دەخۆن.

١٣-لە لاپەڕە (٤٦) وشەی (ڕەنگینە) بکرێت بە (ڕەنگاو ڕەنگ) باشترە هەروەها (ئەو قازانە ببەزێنە) بکرێت بە (لەو قازانە ببەرەوە) باشترە و منداڵ بە ئاسانی تێی دەگات.

١٤-لەلاپەڕە (٥١) باسی بابەتێك دەکرێت کە دوور لە واقیعەو(مثالی)یە، کە ئەمەش هەڵەیە و منداڵ تووشی دووفاقی و نامۆ بوون دەکات، لەم لاپەڕەیەدا نووسراوە کە (مرۆڤ ئازاری مەل نادات و بەردیان تێناگرێ) کە ئەمە دوورە لە واقیع، چونکە ژیانی منداڵان پڕە لە بەرد گرتنە ئاژەڵ و باڵندە، لەلایەکی تریشەوە منداڵ بەبەردوام کەسانی تر دەبینێ کە بەرد دەگرنە مەل و باڵندە و دەشیان کوژن. کەواتە باشتر وایە بکرێت بە (مرۆڤی عاقڵ و بەبەزەیی). ئەو کاتە منداڵ بەراورد دەکات و دەگاتە ئەو ئاکامەی کە ئەوانەی بەرد لە مەل و باڵندەو ئاژەڵ دەگرن (عاقڵ و بە بەزەیی نین) کە ئەمە گونجاوە و بەهایەکی ئاکاری و پەروەردەییشە.

١٥-لە لاپەڕە(٥٦) وشەی (سرکە) بەکار هاتووە، کە ئەمەش منداڵ تێی ناگات باشتر وایە بکرێت بە (لەقە دەهاوێت) (خۆیت پیا دەکێشێت).

١٦-لەلاپەڕە(٥٧) وشەی (بزر) بەکارهاتووە کە زەحمەتە بۆ منداڵ، باشتر وایە بکرێت بە (ون) دەبن.

١٧-لەلاپەڕە(٥٩) وشەی (بلح) بەکارهاتووە، باشتر وایە بکرێت بە (بێ عەقڵ) (توورە).

١٨-لەلاپەڕە(٦١)وشەی (نەوع) بەکارهاتووە، کە ئەمەش عەرەبییە و منداڵ تێی ناگات و باشتر وایە بکرێت بە (جۆر) یان (ڕەنگ) کە ئاسانە بۆ منداڵ.

هەروەها لە لاپەڕە (٦٢) وشەی (جومعە) بکرێت بە (هەینی) باشترە.

١٩-لەلاپەڕە(٦٧) وشەی (زۆزان) بەکاهاتووە، کە ئەمە نەك منداڵ بگرە زۆر کەسی گەورەش نازانن مانای چییە، کەواتە باشتر وایە بکرێت بە (سارد و پرلە بارانە).

٢٠-لەلاپەڕە (٦٨) دووبارە دوو جار وشەی (ئاوازی) بەکارهاتووە، کە باشتر وایە بکرێت بە (گۆرانی) کە ئاسانەو لە هەمان کاتیشدا بۆ بابەتەکە پڕ بە پێستی خۆیەتی، هەروەها لە هەمان لاپەڕەدا وشەی (بیسەندنەوە ) بەکارهاتووە، کە زەحمەتە بۆ منداڵو باشتر وایە بکرێت بە (بیڵێنەوە) کە ئاسان و سوکترە بۆ منداڵ:

٢١-لەلاپەڕە (٧١)وشەی (وەها) بەکارهاتووە و گوزارشت و ئاماژەیە بۆ (کۆلارە) کە بەبڕوای من ئەمە زەحمەتەو منداڵ بە

ئاسانی تێی ناگات، باشتر وایە بکرێت بە (تر) واتە (یاری وەها) دەبێت بە (یاری تر).

٢٢-لە لاپەڕە (٧٢) نوسراوە (بردی و بە باوکی و دایکی ناسی) کە ئەمە لەلایەنی زمانەوانییەوە لەنگی تێدایە و باشتر وایە بنووسرێ (بردی و بە باوکی و دایکی ناساند). هەر لە هەمان لاپەڕە (دۆعا خوازی) بەکارهاتووە، باشتر وایە بکرێ بە (خواحافیزی).

٢٣-لەلاپەڕە (٧٤) وشەی (ئەندام) بەکاهاتووە، بۆئەوەی منداڵ بەئاسانی تێی بگات باشتر وایە بکرێت بە (لەش).

٢٤-لەلاپەڕە (٧٥) نوسراوە (چەند شیرینە و پڕ جۆشە) باشتر وایە بکرێت بە (چەند خۆش و دڵگیرە) چونکە مۆسیقا شیرین نییە، بەڵکو خۆشە، لەلایەکی تریشەوە وشەی (پڕ جۆشە) زۆر زحمەتەو منداڵ لە مانای (جۆشە) تێ ناگات.

٢٥-لەلاپەڕە (٧٧) نووسراوە (بێنە ئەو گولانە بۆتۆ هەڵگرم) باشتر وایە بکرێت بە (ئەو گوڵانە بێنە بۆتی هەڵگرم) کە ئاسانترە و لەگەڵ ڕێزمانی کوردیشدا زیاتر دەگونجێ.

٢٦-لە لاپەڕە (٧٨) وشەکانی (ڕازاو، نەخشاو، بەکوڵ) ڕووت و بێ مانان و منداڵ لێیان تێناگات و پێویستە دەستکاری بکرێن.

٢٧-لەلاپەڕە (٧٩) نووسراوە (ملوانە) باشتر وایە بکرێت بە (ملوانکە).

ب-شێوەو لایەنی هونەری

وەك لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد، دەبێت ناوەڕۆکی کتێب و گۆڤار و نامیلکەکانی تایبەت بە منداڵ، لە ڕێگەی وێنە و نیگار و وشەی شاش و گەورە و کاغەزی ساف و باشەوە، ڕوون بکرێنەوە بۆ ئەوەی منداڵ بە ئاسانی تێیان بگات.

١-باشتر وایە ئەو بابەت و پیتانەی کە مەبەستن و ئامانجی نوسینەکەن بە ڕەنگ و شێوەیەکی جیا بنوسرێت بۆ ئەوەی لەلایەك سەرنجی منداڵ ڕابکێشێ، لەلایەکی تریش لەکاتی یادکردنەوەدا بە ئاسانی بێتەوە یادی، بۆ نمونە لەلاپەڕە (١٠) مەبەست پیتی (ی) و لەلاپەڕە (١١) مەبەست پیتی (و) و لەلاپەڕە (١٢) مەبەست (ە)یە، کەواتە باشتر وایە ئەوانە بەڕەنگ و شێوەیەکی جیا لە نووسینەکانی تر بنوسرێ بەڵام بەداخەوە لەم کتێبەدا ڕەچاوی ئەوە نەکراوە، هەرچەندە هەڵەنییە ئەگەر نەکرێ بەڵام باشتر و زانستیترە ئەگەر بکرێ.

٢-پێویستە وشەکان گەورەترو ڕون و ئاشکراتر بنوسرێن کەمێکیش لەیەکتری دوور بخرێنەوە بۆ ئەوەی منداڵ بەئاسانی بیانخوێنێتەوە و لێکیان جیا بکاتەوە چونکە منداڵ سەرەتای فێربونیەتی و هیچ نازانێ و ئەگەر بچوك و نزیك یەکتر بن تێکەڵیان دەکات. بۆنمونە لەلاپەڕەکانی (٤٥،٤٤،٤٣،٤٢،٣٥،٣١،٢٨،٢٣،٢٢،١٩...تاد)، دەتوانم بڵێم زۆربەی لاپەڕەکان زۆر چڕو پڕن کە ئەمەش زەحمەتە بۆ منداڵی پۆلی یەك، باشتر وایە قەبارەی ئەم کتێبە دوو ئەوەندەی ئێستای گەورەتر بکرێت، ئەوکاتە بەئاسانی جێگای نووسین و وێنەو نیگاری زۆر دەبێتەوە، چونکە لەزۆر شوێن پێویست بە وێنەو نیگاری تر دەکات بەڵام لەبەر بچووکیی لاپەڕەکان نەکراون.

٣-بەداخەوە لەزۆر جێگا وێنەو نیگارەکان و شێوەی چاپ کردنیان لەگەڵ ناوەڕۆکی نووسینەکان ناگونجێت و هەندێك جاریش دژ بەیەکن، کە ئەمەش سەر لەمنداڵ تێك دەدات، بۆ نموونە لەلاپەڕە (١٨) باسی (سەگە زەرد) دەکات بەڵام لە وێنەکەدا سەگەکە سوورباوە نەك زەرد.

٤-هەروەها لەلاپەڕە (٢٥) باسی (مەڕە زەرد) دەکات کەچی لەوێنەکەدا (سوورە).

کە ئەمانە پێویست بە ئەوە دەکات زۆر بەوردی چاپ بکرێن و ڕەنگەکان لەیەکتری جیا بکرێنەوە.

٥-لە لاپەڕە (٣٥) باسی ڕاکردنی (توتکە سوور) دەکات کەچی لەوێنەکەدا (توتکە سوور)نەك ڕاناکات بەڵکو خەریکە پەلاماری (کەوەکە) دەدات، کەواتە لێرەدا پێویستە وێنەو نیگاری زیاتر بکرێن بۆ ئەوەی لە هەموو قۆناغەکاندا بەپێی نووسینەکان مەبەست و ئامانجەکان ڕوون بکرێنەوە.

٦-لە لاپەڕە (٤٢) نووسراوە (بنوارە ئەم هێلکە زەردو سوورانە)، بەڵام لەوێنەکەدا هەموو هێلکەکان زەردن و سووریان تێدا نییە.

٧-لە لاپەڕە (٤٩) وێنەو نیگاری تری پێویستە، چونکە دایك بە منداڵەکەی دەڵێ دانیشە کەچی منداڵەکە خۆی دانیشتووە، هەروەها دەڵێ دوو کفتەی گەورەت بۆ بێنم، بەڵام لەوێنەکەدا یەك کفتەی بۆ هێناوە، کەواتە پێویستە وێنەی زیاتری لەگەڵ بێت.

٨-لە لاپەڕە (٥١) لە تەنیشت چەماوەی داخراوەوە وێنەی پیاوێك کراوە، بەڵام لەناو چەماوەی داخراوەکەدا نووسراوە مرۆڤ، کەواتە دەبوایە لەگەڵ پیاوەکە وێنەی ژن و منداڵیش



بکرایە، چونکە هەر پیاو مرۆڤ نییە، بەڵکو هەموو (ژن و پیاو و منداڵ و گەورە و بچووک) دەگرێتەوە.

٩-لە لاپەڕە (٥٣) نووسراوە (لەو لاوە زەینەب پێ دەکەنێ)، بەڵام لەوێنەکەدا زەینەب قوڕو قەپی کردووەو بە هیچ شێوەیەك پێ ناکەنێ، بەڵکو سەیری دەکات.

١٠-هەر لەلاپەڕە (٥٣) لە تەنیشت بازنەکە وێنەکە کراوە کە گوایە ساجە، بەڵام نەك منداڵ بڕواناکەم گەورەش بە ئاسانی بزانێت ئەوە ساجە مەگەر نووسراوی ناو بازنەکە بخوێنێتەوە.

١١-لە لاپەڕە (٥٢) لە تەنیشت بازنەکە وێنەیەك کێشراوە کە بە هیچ شێوەیەك سەیارە نییە، بەڵام لە جیاتی سەیارە کراوەو ئاماژەیە بۆ (ڤرە ڤڕ).

١٢-لە لاپەڕە (٥٦) لەناو بازنەدا نووسراوە (چالاك) کە لەهەموو لاپەڕەکاندا وێنەکەشی گوزارشت لە نووسینەکە دەکات، بەڵام لەم لاپەڕەیەدا، وێنەکە چالاك و گوێدرێژێکە و کەواتە وێنەی گوێدرێژەکە زیادە و پێویست ناکات.

١٣-وێنەی لاپەڕە (٥٧) تەواو نییە، چونکە نووسراوە (ئازاد بنواڕە قەد شاخ) واتە ئەمان دوورن و قەد شاخ نزیك نییە، بەڵام لەوێنەکەدا زۆر نزیکە و هەر دەڵێی منداڵەکان خۆیان لە قەد شاخن، کەواتە زۆر پێویستە گرنگیی زیاتر بە وێنەکان بدرێت.

١٤-نووسراوی ناو بازنەی لاپەڕە (٥٨) (خورما)یە، بەڵام وێنەکە (دار خورمایە) کەواتە باشتر وایە وێنەی کارتۆنێك خورما یان چەند دەنکە خورمایەك بکێشرێت نەك دار خورما، بۆ ئەوەی وێنە و نووسین وەك یەك بن و منداڵ چەواشە نەکەن.

١٥-لە لاپەڕە (٦١) نووسراوە (حەوتی سپی و هەشتی ڕەش)، بەڵام لە وێنەکاندا (بەتایبەتی ڕەشەکان) هەندێکیان خۆڵەمێشین هەندێکی تریان قاوەیی و هەندێکیشیان ڕەش و بۆر، کە بەبڕوای ئێمە ئەمە زیان بە فێربوونی ڕەنگەکان دەگەیەنێت و دوور نییە منداڵ نەتوانێت ڕەنگەکان لەیەکتری جیابکاتەوە و تووشی ڕەنگ کوێری ببێت یان چەواشە بکرێت. هەروەها لە هەمان

لاپەڕەدا لەسەرەوە وێنەی سەری مەڕێکی زەرد کراوە کە لە نووسینەکاندا باسی ڕەنگی زەردی تێدا نییە و تەنیا باسی دوو جۆر ڕەنگ دەکات (ڕەش و سپی). هەروەها لەتەنیشت بازنەکەوە وێنەیەك کراوە زیاتر لە سەگ و ڕێوی و گورگ دەچێت نەك مەڕو ڕەنگیشی پرتەقاڵی و سووربابوە، بەڵام نووسینی ناو بازنەکە ئاماژە بۆ مەڕ دەکات. کە بەداخەوە وێنەکان نزیکن لە چێشتی (مجەور) نەك ڕوونکردنەوەی نوسینەکان.

١٦–لە لاپەڕە (٦٣) باسی قەلە ڕەش دەکات، بەڵام وێنەی یەکێك لە قەلەکان کە مەبەستی سەرەکییە زۆربەی گیانی سپییە. کە ئەمانە بەڵگەن کە هیچ گرنگییەك بە وێنەکان نەدراوە.

١٧–لە لاپەڕە (٦٤) نووسراوە (ئەوەی سواری وڵاغێکی ڕەش بووە هەموویانی بەجێ هێشتووە) کەچی لە وێنەکەدا ئەو سوارەش لە تەنیشت ئەوانی تر دەڕوات و وا دەرناکەوێ کە ئەوانی تری بەجێ هێشتبێ. واتە زۆر لەیەکەوە نزیکن و پێچەوانەی نووسینەکەیە.

١٨–لە لاپەڕە (٦٦) نووسراوە (ئاڵای وڵاتمان چوار ڕەنگە، سووروو زەردو سپی و سەوز) کەچی لەوێنەکەدا ڕەنگی زەرد هەرنییە و ڕەشە، من نازانم ئەم زەردە بۆ چووە شوێنی ئەو ڕەشە، ئەگەر مەبەست ئاڵای کوردستانە دەبێت وێنەکە بگۆڕدرێ، ئەگەر مەبەست ئاڵای عێراقە دەبێت نووسینەکە بگۆڕدرێ.

١٩–لە لاپەڕە (٦٧) نووسراوە (گوندی ئێمە هەموو لایەکی دارستانە) کەچی لەوێنەکەدا وا نییە و هەموو لایەکی دارستان نییە.

٢٠–لە لاپەڕە (٧٠) نووسراوە (نەسرین چا لێ دەنێ و پێ دەکەنێ)، بەڵام لە وێنەکەدا هیچ پێ ناکەنێ، کەواتە لێرەش پێویست بە وێنەی تر دەکات بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە.

٢١–لە لاپەڕە (٧٣) باسی (باسووق و سرکە و دۆشاو و سنجووق) دەکات، باشتر وا بوو کە وێنەیان بکێشرایە، چونکە زۆر منداڵ نەك هەر نەیدیوە، بەڵکو ناویشی نەبیستووە.

٢٢–لە لاپەڕە (٧٥) باسی مامۆستای تێدایە، باشتر وابوو کە وێنەی مامۆستاشی لەگەڵدا بووایە.

٢٣–لە لاپەڕە (٧٦) نووسراوە (وەرە بووکەکەشت بێنە لامان)، بەڵام لە وێنەکەدا لە تەنیشتییەوەیەتی، کەواتە دەبوایە وێنەی تر لە پێشتر هەبووایە.

٢٤–لە لاپەڕە (٥٨) نووسراوە (خەریکی خوێندنەوەم)، بەڵام لەوێنەکەدا قەڵەمی بەدەستەوەیە و خەریکی نووسینە.

٢٥–تالاپەڕە (٤١) ئەو پیتەی لەناو بازنەدا نووسراوە هەمان پیتەکە لە بازنەی لاپەڕەکەی بەرانبەری نووسراوە، بەڵام تەنیا جیاوازی ئەوەیە کە یەکێکیان لە (سەرەتا) یا (ناوەڕاست)، بەڵام ئەوەی بەرانبەر ئەو پیتەیە کە (لە کۆتایی) وشەکە دەنووسرێ، کە ئەمەش فێربوونی بۆ منداڵ ئاسان دەکات و بەیەکتری بەراوردیان دەکات، بەڵام بەداخەوە لەلاپەڕە (٤٢) (٤٣)ەوە تێکچووە لە جیاتی ئەوەی لە پەڕەکەی بەرانبەری بێت کەوتۆتە پەڕەی ئەودیوو لەپشتەوە کە زەحمەت و گرانترە بۆ بەراوردکردن کەواتەپێویستە هەموو ئەوانەی دواتریش وەك پێش لاپەڕە (٤٢)ی لێ بکرێت.

نەك هەر ئەوەندە ، بەڵکو پێویستە (لا) لەلاپەڕە (٤٧) لەگەڵ (لا)ی لاپەڕە (٥٠)بێت کەچی زۆر لەیەکتری دوورخراونەتەو نەك لەپشت و بەرامبەری نەماوە، بەڵکو سێ چوار لاپەڕەش دوور خراوەتەوە.

٢٦–لەزۆربەی لاپەڕەکان وێنەکان نزیکن لەنوسراوی ناو بازنەکەو لەتەنیشتییەوەیەتی کەئەمە ڕاستەو منداڵ نووسین و وێنەکان بەراورد دەکات، بەڵام لەلاپەڕەکانی (٥٧، ٦٣) زۆر دوور کەوتووەتەوە.

٢٧–خۆزگە هەموو بابەتەکان بەیەك شێوە بنوسرانایە، بۆ نموونە لەزۆربەی لاپەڕەکان بەسەریەکەوە نووسراون، بەڵام لەهەندێك جێگا وەك لاپەڕە (٤٣، ٤٨، ٥١، ٤٢ ،٥٣) بەجیا وشەکانی (هەڵدەکەنن، هەڵکەنن، باش بە، نەمزانی، هەڵدەکات، پێدەکەنێت) نوسراون، بۆ ئەوەی منداڵانمان وەك ئێمە سەریان لێ تێك نەچێت و هەرجارەی بەجۆرێك نەنووسن، بەبڕوای من کۆڕی زانیاری کورد و مامۆستایانی زمانی کوردی دەتوانن ئەو بابەتە یەك لا بکەنەوە و کتێبەکانی قوتابخانە هەرهەمووی یان (بەجیا) یان (بەسەریەکەوە) بنووسنەوە بۆ ئەوەی منداڵی کورد هەرلەمنداڵییەوە لەسەر شێوازێکی نووسین ڕابهێندرێت.

٢٨–وابزانم ئێستا ئێمە لە هەزارەی سێیەم و سەدەی بیست ویەك دەژین و کاتی ئەوە هاتووە کە کەمێك گرنگی بەمنداڵی کورد و پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن بدەین و ئاواتەخوازم کە جارێکی تر بەکۆمپیووتەر نەك بەدەست و بەشێوەیەکی جوان و سەرنج ڕاکێش و گەورە و لەسەر وەرەقەی ئارت و بە قەبارەی گەورە و پڕ لە وێنە و نیگاری جوان ئەو کتێبە بەنرخەی مامۆستای خوالێخۆش بوو (ئیبراهیم باڵدار) دووبارە چاپ بکرێتەوە و لەو هەڵەو کەم و کورتییانە (کە زۆربەی زۆریان هونەری و ڕواڵەتن و تایبەتن بەچاپ و شێوەی چاپکردنی) پاك بکرێتەوە. بۆ ئەوی بەشێوەیەکی باشتر منداڵی کوردی پێ فێری زمان بکرێت. ئەوەندە ماوە بڵێم هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی خوالێخۆش بوو مامۆستای نەوەکان مامۆستا (ئیبراهیم باڵدار)ی خەمخۆری منداڵانی کوردو هەزار ئەوەندەش سوپاس بۆ ئەوانەی کە بەشداری لە گوتنەوەی ئەو وانەیەو بەرەو پێش بردنی دەکەن ..

سەرچاوە:

گۆڤاری ڕاسان، ژمارە٤٧، ٥ی مایسی ٢٠٠١ هەولێر.

# گەڕانەوە بۆ نیشتمانی منداڵییەکان

## خوێندنەوەیەك بۆ کتێبی (ئەلف و بێ ی نوێ)ی ئیبراهیم باڵدار*

ڕێبوار سیوەیلی

ئەگەر ئەو بۆچوونە ڕاست بێت کە دەڵێت: کتێب پەنجەرەیەکی ترە بۆ ئاشنابوون لەگەڵ جیهان، ئەوە لەدایکبوونی ئێمەو ئاشنا بوونمان بەجیهان و ژیانمان لەناو جیهاندا، لە خوێندنەوەی یەکەم کتێبەوە دەستپێدەکات. بەمانایەکی تر ئێمە کاتێك لەدایك دەبین لەڕووی بایۆلۆژییەوە دێینە ناو جیهانەوە، بەڵام ئەوە یەکەم کتێبە کە ئێمە بە جیهان ئاشنا دەکات و ژیانمان پێدەناسێنێ. لەم تێڕوانینەوە ئێمە چەندە کچ و کوڕی دایك و باوکمانین لەڕووی بایۆلۆژییەوە، ئەوەندەش لەڕووی ئاشنابوونمان بە جیهان، ئەوەی مرۆڤێکین کە یەکەم کتێبی ژیانی زۆربەمان لەبەرهەمی خامەی ئەوە (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) ناوی ئەو کەسەیەو کتێبەکەیشی (ئەلف و بێی نوێ)یە.

ئەلف و بێ ی نوێ بەر لەوەی ئەلف و بێی نوێی زمانێك و کولتوورێك بێ، ئەلف و بێی نوێی ئاشنابوون بەجیهانێکەو دەروازەیەکە بۆ هاتنە ناو ژیانێکی منداڵانەوە. بۆیە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بەبێ ئەو هەستیارییە منداڵانەیە کارێکی وشك دەردەچێت و پێویستە لە هەموو خوێندنەوەیەکی ئەم کتێبەدا، بەشێ لە ئیشکردنمان بریتیبێ لە گەڕان بەدوای منداڵیی لەدەست دەرچووی خۆماندا، منداڵییەك، کە بۆی هەیە نیشانەکانی لەناو لاپەڕە ڕەنگاوڕەنگەکانی ئەو کتێبەدا پارێزراوبن، دەنا لەهیچ شوێنێکی دیکەی ئەم جیهانەدا پاشماوەیەکی لێ بەجێ نەماوە.

ئەگەر وەك داهێنان تەماشای کتێبەکی باڵداری نەمر بکەین، ئەوە ئەم کتێبە لەژیانی مرۆڤی کوردا هەمان گرنگیی هەیە، کە ساتەوەختی ئادەم هەیەتی لەناولێنانی بوونەوەرو شتەکاندا.

بەمانایەکی تر، ئەگەر شتەکان و بوونەوەرەکان لەو کاتەوە بوونی خۆیان بەدەست هێنابێت، کە ئادەم لەپۆلی یەکەمی سەرەتایی ژیانی خۆیدا ناوی بۆ دۆزینەوە، ئەوە بوونی ئێمەی لە ژیانی خۆماندا ئەو کاتە دەستپێکردووە، کە کتێبەکەی باڵدار دەروازەی جیهانمان بەسەردا دەکاتەوەو شتەکان و بوونەوەرەکانمان بۆ ناو دەنێت. کردەی باڵدار لەژیانی ئێمەدا، کردەیەکی داهێنەرانەیە کە دەیەوێت بە (ئەلف و بێیەکی نوێ) لەجیهاندا لەدایکببین و ژیانمان پێ ئاشنا بکات.

کردەی داهێنەرانە هەمیشە پێویستی بەزمانێکی نوێ و ئەلف و بێیەکی نوێ لەبەرامبەر زمان و ئەلف و بێیەکی کۆندا، کە چیدی ناتوانێت ببێتە پرد لەنێوان ئێمەو جیهاندا. ئەو کەسانەش کە هەڵدەستن بەداهێنان، واتە بەڕزگارکردنی ئێمە لەزمانێکی کۆن و کۆچپێکردنمان بەرەو ئەلف و بێی زمانێکی نوێ، هەڵگری خەونی فڕین و دەربازبوونن و چارەنوسیشیان بەپێی لێکدانەوەی (گاستۆن باشلار) بۆ ڕەگەزو توخمە پێکهێنەرەکانی سروشت: (ئاگر، خاك، ئاو، با) دەچێتە سەر ڕەگەزی (با).

لەلای باشلار توخمە سروشتیەکان ڕەنگدانەوەیەکی قووڵ و پڕ مانایان لەژیانی مرۆڤدا هەیەو داهێنەریش ئەو کەسەیە، کە سروشتی داهێنانەکەی لەگەڵ خەسڵەتەکانی یەکێك لەو توخمە سرووشتیانە بگونجێنێ.

ئیبراهیم باڵدار، چ لەناوەکەیداو چ لەداهێنانەکەیدا، هەڵگری خەسڵەتەکانی (با)یە، خەیاڵی ئەو، خەیاڵ لەسەر بنەمای سروشتی (با)وە دروستبووەو یەکێك لەو وێنایانەی ڕەگەزی (با)ش لەزەینی مرۆڤدا دەیانسازێنێ، خەونی فڕینە. هەوا ئازادییەو ئازادبوونیش جۆرێکە لەفڕین و خۆگواستنەوە لەشتێکی کۆنەوە بەرەو شتێکی نوێ. لە شوێنێکی ئاشناو

* هاولاتی ژ ١١٠ ڕۆژی ٢٠٠٣/٢/١٠

دیارەوە بۆ جێگەیەکی نائاشناو نادیار، تاکو لەوێ سەر لەنوێ ژیان دەستپێبکاتەوە. (ئەمەیە سیحری سەفەری تووی گوڵاڵەسووره لەسەر پشتی (با) بۆ ناو بەینی دووتاشەبەردا). لەبەر ئەوە ئەلف و بێی نوێ زمانی خوڵقێنەرێکە، دەیەوێ لە کۆنەوە بمانگوێزێتەوە بۆ دنیایەکی نوێ، لەشوێنە بەرتەسکەکانی واقیعەوە بۆ کەلێن و قوژبنە فرەمەوداکانی خەیاڵ، بۆ ناو ئازادییەکی فراوانتره.

سەیر نیە کە ئەرکی ئەو گواستنەوەو فرینە لەداهێنان و کردەی خوڵقێنەردا، یاخود لە کردەیەکدا کە نزیکە لەکردەی یەزدانیەوە، بەزمان سپێردراوە. واتە زمان کراوەتە پردی پەیوەندیو خوڵقێنەر لەرێگەی ئەلف و بێو وشەکانەوە پەیامی خۆی ئاراستە دەکات. زمانیش هەڵگری هەموو ئەو پەیامانە بووە، کە لەلایەن داهێنەرەکانەوە ئاراستەی مرۆڤ کراون و وشەکان کلیلی کردنەوەی دەرگاکانی جیهان بوون (لەسەرەتادا وشە هەبوو) وەك لەتەوراتدا هاتووە.

ئەو جیهانەی باڵدار لەرێگەی ئەلف و بێ نوێکەیەوە دەرگاکەیمان بەسەردا دەکاتەوە، راستە جیهانێکە کەسمان تیایدا نەژیاوین و کەسمان لەقارەمانەکانی ناوی نەچووین، بەڵام ئەوەش راستە کە ئەو کتێبە خەیاڵی هەموومانی بزواند تا هەوڵبدەین، تا ژیانی خۆمان لەو ژیانە رەنگاورەنگە نزیك بخەینەوە کە لە (ئەلف و بێی نوێ)دا هەیە. لەراستیدا ژیان بۆ منداڵەکانی ناو کتێبەکەی باڵدار، لەچاو ئەو ژیانەدا کە ئێمەی منداڵیی خۆمانی تیا ژیاین، ژیانێکی نموونەیی و یۆتۆپیاییە. ئێمە کەسمان لەمنداڵیماندا جلوبەرگی وەك منداڵەکانی ناو جیهانی ئەلف و بێی نوێمان لەبەردا نەبوو، وەلێ خۆزگە خواستن بۆ لەبەرکردنی ئەو جلوبەرگانە، بوو بەخۆزگەی ناو سەرە بچکۆلەکەی هەموومان. درەخت و میوەو سەگ و دۆو دادەو پشیلەو ریشۆڵەو مامۆستاو باوك و ماڵ و یارییەکانی ناو ئەلف و بێی باڵدار، هیچیان لەودرەخت و میوەو سەگ و پشیلەو ریشۆڵانە نەدەچوون، کە لەژیانی ئێمەدا هەبوون، هەروەها بەرێکەوت دادەو باوەو مامۆستاکانی ناو ژیانی خۆمان هێندەی ئەوانەی ناو جیهانی ئەلف و بێی باڵدار،



میهرەبان بوون. بەلاّم جیهان و شت و کەسەکانی ناو کتێبەکە نموونەو خۆزگەیەك بوون لەبەردەممانـدا.. ئەو کتێبەی فێری نەکردین چۆن جیهانی خۆمان بناسینەوە، بەڵکو جیهانی خۆمانی لەلا نامۆکردین، چونکە هیچ شتێکی، تەنانەت ڕەنگی سەوزایی چیاو ڕەنگاوڕەنگیی تۆپ و پەپوولەکانیشی لەهی جیهانی خۆمان نەدەچوون.. کەواتە ئەم کتێبە بەجۆرێ لەجۆرەکان فێری کردووین بەدوای جیهانێکی ئەلتەرناتیڤدا بگەڕێین و لێرەشەوە یەکێك لەئامانجە پەروەردەییەکانی خۆی پێکاوە کە بریتیە لەڕۆشنگەرکردنی مرۆڤ و هاندانی بەرەو دۆزینەوەی دنیایەکی تر، جیاوازی بێت لەوەی تیایدا دەژی. ئەم کتێبە لەوێدا جەوهەری پەروەردەییبونی خۆی ئاشکرا دەکات، کە نەك هەر تەنیا منداڵیی دەوروبەری خۆمان. (هەموو لەبیرمانە کاتێ لەقوتابخانە دەگەڕاینەوە، بەهەڵمی پەنجەرەکە دەماننووسی: (دارا دوو داری دی!)و ئیدی لەشوێنی ئەو پیتانەوە کە ئەو ڕستەیەمان لەسەر هەڵمەکە پێدەنووسین، تەماشای دنیای دەرەوەمان دەکرد.

بەمانایەکی تر ئەگەر ئەم کتێبە بە تێڕوانینی باڵدار بۆ ژیان و بوون لەقەڵەم بدەین، ئەوە دەتوانین هەوڵە داهێنەرانەکەی باڵدار لە چەند تەوەرێکدا بخەینە بەرباس. واتە ئەگەر ئەم کتێبە پەنجەرەیەك بێت بۆ ئاشنا بوون لەگەڵ جیهان، ئەوە جیهانی پێشنیارکراوی باڵدار، بەشێوەیەکی زۆر پەروەردەییانەو لە ئاستی دەرککردنی منداڵ بۆ ماناکانی ژیان، ئەم خەسڵەتانەی هەیە کە هەوڵ دەدەم لێرەدا بەکورتی بەرهەمیان بهێنمەوەو تەئویلیان بکەم:

یەکەم: بوون لەجیهاندا لای باڵدار، ژیانی ناو سروشت دەگرێتەوە. بەخۆڕایی نیە یەکەم وانەی ناو ئەم جیهانە بریتییە لە ئاشنا کردنی منداڵ بە (دار)، هەڵبەت دار وەك نوێنەری سروشت و پاشانیش وردەوردە ئاژەڵ و باڵندەو چیاکانیش وەك بەشێك لە سروشت دەناسێنێ و مەودای دەرککردنی منداڵ لە جیهانی دەوروبەری خۆی بەرفراوان دەکات.

کەواتە باڵدار باس لەجیهانێکی نا مومکین ناکات، بەڵکو دەستنیشانکردنی ئەو بۆ ئەو شوێنەی کە دەشێت بوونی ڕاستەقینەی خۆمانی تێدا بەرینە سەر، دەستنیشانکردنی واقیعییانەیە نەك ئایدیالیستانە. ئەو شوێنە جیهانی سروشتە نەك بەهەشت، دنیایەکە دەشێت ئەزموونی بکەین، نەك دنیایەکە ر او، کە گریمانی ئەزموونکردنی لەئارادا نیەو بێگومان لەپشت ئەمەوە ئامانجێکی پەروەردەیی عەقلانیانە هەیە، ئەمەش وای کردووە زمانی کتێبەکەی باڵداریش زمانێکی واقیعیانەی ڕۆژانەیی بێت، نەك زمانێکی ئاینیانەی ئایدیالیزە کراو.

دووەم: بوونی واقیعی، بوونە لەگەڵ ئەوانیترو لەگەڵ مرۆڤەکانی تر. بۆیە وانەی دووەمی ناو کتێبی ئەلف و بێی نوێ بریتیە لەئاشناکردنی ئێمە بە (دارا)و ئاشتکردنەوەی لەگەڵ (دار)دا، دارا داری دی (ل:٦)، واتە دروستکردنەوەی پەیوەندی لەنێوان مرۆڤ و سروشتدا. هەڵبەت لەئاستی دیداریدا (مرئی) پەیوەندی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ، لەوێنەی سەر بەرگی کتێبەکەوە دانی پێدا نراوە، بەلاّم لەئاستی نووسین و تێکستەکەدا، (مێ) هەتا وانەی هەشتەم ناوی نیە! تەنیا لەوێدایە کە (زارا)مان لەسەر ئیقاعی ناوی (دارا) پێدەناسێنێ. لێرەدا دوو خاڵ تێبینی دەکرێت، کە لەواقیعیبوونی جیهانبینی کتێبەکە کەم دەکەنەوە:

ئەلف: جیهانی ناو کتێبەکەی باڵدار بەوێنەی جیهانی بەهەشتیی ناو کتێبە ئاینیە مەزنەکانی وەك تەورات و ئینجیل و قورئان، جیهانێکە یەکەمجار ماف بەنێرینە دەدات تیایدا بژی و جیهانێکی پیاو سالاریە. بوون یەکەمجار بوونی نێرەو پاشان دەبێتە بوونی مێ. شەرعیەت یەکەمجار هی پیاوە، پاشان ئافرەت شەرعیەتی بوونی خۆی وەردەگرێ و بوونی ئەو دەبێتە بوونێکی پەراوێزی.

بێ: لەنێوان گۆکردنی ناوی (دارا)و (زارا)و مۆسیقا هەردوو ناوی (ئادەم)و (حەوا)، یان (ئیڤا)دا لێکچوون و نزیکایەتی هەیەو لەهەردوو حاڵەتیشدا مێینە دەکەوێتە پاش نێرینەوە.

سێیەم: بوون لەناو جیهاندا، بوونە لەناو ژیانێکی سروشتیداو بوون و ژیانە لەگەڵ ئەوانیترو ئاژەڵ و باڵندەکاندا. بەلاّم خۆشترین ئاست و ساتەوەختی ژیان بۆ منداڵ، ئەوەیە کە ئەو ژیانە پڕ بیت لەیاری. یاری بەشێکی گرنگ و چێژ بەخشە لەژیانی داراو زاراو هاوڕێکانیدا، کە دەتوانین ئەم ڕاستیەش هەر لەوێنەی بەرگی کتێبەکەوە تێبینی بکەین و پاشان لەوانەکانی (٨،٦،٤،٣،٢،هتد)، ر گەلێ وانەی تردا بەڵگەی بۆ بهێنینەوە.

کەواتە لەتێڕوانینە پەروەردەییەکەی باڵداردا یاری و وازی کردن هەم بەشێکە لە ژیان و هەم جۆرێکیشە لە پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان پێکەوە. بەڵام هەموو ژیان وازی نییەو بۆی هەیە ژیان (داو) و (ڕاو) یشی تێدا بێت وەك لە (لاپەڕە: ٧و١٢) دا دەبینرێت. سەیر لەوەدایە ئەوەی داو دەنێتەوەو ڕاو دەکات، دارایە نەك زارا، واتە ڕەگەزی نێرە نەك ڕەگەزی مێ و لێرەشدا جیهانبینی باڵدار لەسەر مێ، لە جیهانبینی ناو چیرۆکی ئادەم و حەوای کتێبە ئاسمانییەکان جیادەبێتەوە. چونکە لەو بەسەرهاتەدا ئەوەی دەبێتە سەرچاوەی خراپە، یان هەڵەکردن، حەوایە نەك ئادەم. جێی سەرنجە کە باڵدار لە تێڕوانینە پەروەردەییەکەی خۆیدا تێڕوانینێکی پیاو/نێر سالارانە لەسەر مێ فێری منداڵ ناکات، کە بێگومان ئەو تێڕوانینە لەکاتی نووسینی بەرهەمەکەی و هەتا ئێستاش لە کۆمەڵگەی ئێمەدا لەسەر مێ باڵادەستە. کەواتە ئەوە مەرجێکی پەروەردەییانەی باڵدارە بۆ بەرهەمهێنانی تێکست بۆ منداڵ، کە نابێت لایەنگیرانە بێت و فەزڵی ڕەگەزێك بدات بەسەر ئەوەی تردا.

چوارەم: لەلای باڵدار یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی فەلسەفەی پەروەردە بریتییە لە بەرهەمهێنانی مەعریفە لەسەر جیهان و دەستنیشانکردنی گۆڕانکاری و جموجوڵەکانی ناو دنیای دەوروبەر. (لێرەدا باڵدار بەئاراستەی ئەو کۆمەڵە فەیلەسوفانەدا کاردەکات، کە لەمێژووی فەلسەفەدا بە فەیلەسوفانی سروشت ناو دەبرێن و کاریان ئەوە بوو لە سروشت و دیاردەو دەرکەوتەکانی وردببنەوە و لەوێوە مەعریفەیەك لەبارەی سەرەتای گەردوونەوە بەرهەم بهێنن)، ژمارەی ئەو بابەتانەی کتێبەکەی باڵدار، کە تیایدا وەسف و دەستنیشانی دیاردەو گۆڕانەکان دەکرێت،لە ئەلف و بێی نوێدا کەم نین و هەریەك لە وانەکانی (دۆ ڕژاوە ل:١٥، داریدرێژ ل:١٧، باران دەبارێت ل:٢٤، گڤەگڤی با ل:٤٨) بەڵگەی ئەم بۆچوونەن. واتە منداڵ لەڕێی ئەم وانانەوە لەو گۆڕنکاریانە ئاگادار دەکرێتەوە کە لە دەوروبەری ڕوو دەدەن و ئەمەش دەبێتە هۆی دروستکردنی پەیوەندیەك لە نێوان منداڵ و دەوروبەری .

پێنجەم: بوون لەناو جیهاندا، بوونێکی بێ ئامانج نییە و هەر تەنیا لەسەر گەرمبوونی تاکە کەس بە یاری و ناسین و دەستنیشانکردنی مرۆڤ بۆ دیاردەکان و گۆڕانەکاندا، کورتنابێتەوە. بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی پەروەردەکردن، دروستکردنی مەعریفە بێت لەسەر ژیان لەلای منداڵ، ئەوا ئامانجی ئەو مەعریفەیە پێویستە پەروەردەکردنی هەستی بەرپرسیاری و دەروەستی بێت لەلای ئەومنداڵە.

باڵدار ئەم هەستە لەسەر پرەنسیپی (تێگەیشتن) و (پێویستییەوە) دروست دەکا، نەك لەسەر پرنسیپی ترس و گوناهبارکردن و سزادانەوە. واتە باڵدار، وەزیفەی پەروەردە بە دروستکردنی ترس و گوناه و سزا بڕینەوە دەستنیشان ناکات، بەڵکو منداڵ هاندەدات پەیوەندییەکی هاوکارانە لەگەڵ سروشتی دەوروبەریدا دروست بکات و ئەم پەیوەندیەش ببێتە هۆی تێگەیشتنی مرۆڤ، یان منداڵ لەدەوروبەرەکەی، لەوانەی (ئاودان، ل:١٨)دا، زاراو ئازاد دەڕۆن دار ئاو دەدەن، لەوانەی (نازێ: ل١٨) و (دار دەڕوێنم ل: ١٩)دا، نەوڕۆزو نازێ دەچن دار بڕوێنن، لەوانەی (پشە سپی، ل: ٣٣)دا، زەینەب نان و پەنیر دەداتە پشە سپی و داوای لێدەکات لێی نەترسێ. لەوانەی (وسبە ل: ٢٦)و لەوانەی (مرۆڤ ل: ٤٧)دا، هەر یەك لە دارا و ئازاد (دیسانەوە دوو نێر!) دەیانەوێ ئازاری مەلەکان بدەن، بەڵام هەردووکیان دەست لەو کارە هەڵدەگرن چونکە وەك (نەسرین/ڕەگەزی مێ) پێیان دەڵێت: (برا مرۆڤ وا ناکات، مرۆڤ ئازاری مەل نادات).

لەهەندێ وانەی دیکەدا، مرۆڤ نەك هەر تەنیا ئازاری گیاندارەکانی دی نادات، بەڵکو ڕۆڵی ناوبژیکەریش لەنێوانیاندا دەگێڕێت و بەرپرسیارییەکی زیاتر دەگرێتە ئەستۆی خۆی، کە باڵدار بەزمانێکی شەففاف و نزیك لەدنیای منداڵییەوە، دەری بڕیوە. یاخود منداڵ فێر دەکات خۆی تێکەڵ بەهەموو ناکۆکییەك نەکات و مەرج نیە ببێتە لایەنێك لەلایەنەکانی ناکۆکی:

لەوانەی (شەڕە مریشك ل: ٣)و لەوانەی (قەلەڕەش ل: ٥٩)دا مرۆڤ ناوبژی دەکات و لەوانەی (سێ سەگ ل: ٣٤)دا، کە بەهەرسێکیان کەروێشکێك ڕاو دەنێن، بێ لایەن دەوەستێت وتەنیا داوا دەکات لەو دیمەنە ڕابمێنین و هیچیتر.

شەشەم: لە جیهانە پەروەردەییەکەی باڵداردا، منداڵ هەر تەنیا بوونێکی پاسیڤ و وازیکەرو بەرپرسیار نیە، بەڵکو کەسێکە چالاك و بکەرێکی خاوەن هەڵوێست و بەرهەمە. واتە

باڵدار بەئەرکی پەروەردەی دەزانێ کە منداڵ هانبدات بۆ نواندنی چالاکی و کارکردن، چونکە ئەو ئەرکی پەروەردەکردن هەر لەو خەسڵەتانەدا کورت ناکاتەوە، کە پێشتر باسمانکردن، بەڵکو وەك دەردەکەوێ، پەروەردە لەلای باڵدار هێزێکی هاندەریشە بۆ چالاکی و دروستکردنی ڕۆحی یارمەتیدان، لەوانەی (سێو ل: ٢٧) ئازاد سێو بۆ نەسرین بەردەداتەوەو لەوانەی (نانی ساج ل: ٤٩)دا، نەسرین نان دەکات و لەوانەی (کاری ناو ماڵ ل: ٦٦)دا، نەسرین چا لێدەنێ و نێرگز بەدەم سترانبێژییەوە پیاڵەکان دەشوات و لە وانەی (گوڵ چاندن ل:٧٣)دا، جوامێر داوا لە نێرگز دەکات ڕێگەی بدات یارمەتی بدات و گوڵەکانی دەستی بۆ هەڵگرێ.

بەمجۆرەش باڵدار بوونی ناو جیهانە تایبەتی و منداڵانەکەی دەکاتە بوونێکی چالاك و بەرهەمهێن و ڕوحی یارمەتیدانیش دەکاتە خەسڵەتی بنەڕەتی ناو ئەو جیهانە.

حەوتەم: ئەگەرچی ڕەگەزی حکایەت کردن و گێڕانەوە (Naration) لەکتێبە نایابەکەی باڵداردا زۆر ئاشکراو دیارە و دەکرێ ئەم کتێبە وەك ڕیوایەتێك لەسەر ژیانی کۆمەڵە کاراکتەرێك بخوێنینەوە، بەڵام ژمارەی ئەو وانانەی تیایاندا گێڕانەوە لەلای باڵدار هەر تەنیا مەسەلەیەکی تەکنیکی نییە، کە ئەو وەك پەروردەکارێك تیایدا شارەزایی تەواوی هەیە. بەڵکو گێڕانەوە بەشێکی گرنگە لە سازدانی ئەو جیهانەدا کە باڵدار وەك جیهانێکی پەروەردەیی ئەلتەرناتیف پێشنیاری کردووە. گێڕانەوە لەم بەرهەمەدا ئەرکێکی پەروەردەیی جێبەجێ دەکات، کە بریتییە لە پەیوەندی دروستکردن لە نێوان ڕابردوو، ئێستاو داهاتوودا. بە مانایەکی دی: بوون لە فەلسەفە پەروەردەییەکەی باڵداردا خاوەنی مێژوویەکی تایبەت بە خۆیەتی کە پڕە لە بەسەرهات و ئەزموون، کە دەشێت منداڵ لێیانەوە فێرببێت و بەهۆیانەوە بەرچاو ڕوون بێت.

باڵدار بە پێچەوانەی حەکایەتە فۆلکلۆری و باوەکانەوە، لە گێڕانەوەکانیدا (بەدەگمەن نەبێت) پشت لە ئامۆژگاری کردن و پەند دانانی منداڵان نابەستێت، بەڵکو ئەو لە گێڕانەوەکانیدا ڕوداوێك، یان زەمەنێك بەیان دەکات بەبێ ئەوەی بەباش، یان بە خراپ حوکمی بەسەردا دەربکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە باڵدار، خەسڵەتێکی گرنگی فەلسەفەی پەروەردە ڕەچاو دەکات،



کە بریتییە لە دروستکردنی ئیمکاناتی هەڵبژاردن لە بەردەم منداڵداو خستنەڕوی ڕوداوێك لەبەردەم لێکدانەوەکانیدا، وەلێ بڕیاری هەڵبژاردن بۆ منداڵەکە خۆی دەهێڵێتەوە: ئایا ئەو ڕوداوە، یان کردەوەیە دووبارە دەکاتەوە، یان نا؟

لەوانەی (گوندی ئێمە ل:٦٣) دا، گێڕانەوەکە هاندان و حوکمدانی تێدایەو باس لە گوندی ئێمە دەکات کە: (گەلێك جوانە، چونکە گوندێکی ڕەنگینی کوردستانە)، بەلاّم لە وانەی (سەردان ل:٦٨) و لەوانەی (ترێ ل:٩٦) و هەروەها لەوانەی (نیگارەکانی نێرگز:ل٧٧-٧٨)، کەباس لە چیرۆکی گورگ و بزن دەکات، هاندان و حوکمدانی تێدا نییە و گێڕانەوەکە تەنیا بە بەیانکردنی بارودۆخەکە گیرساوەتەوە.

بەهێزترین دۆخی گێڕانەوە لەدوایین وانەی کتێبی ئەلف و بێی نوێدا بەدی دەکەین، کە بریتیە لەپێداچوونەوەیەکی گشتی بەکۆی ئەو ماوەیەدا، کە وەك (مێژووی هاوبەش)ی منداڵەکان دروستبووە. منداڵەکان لەیادکردنەوەی ئەو مێژووەدا، ژیانێکیان بەبیردێتەوە کە پڕە لەپەیوەندی و یاریکردن و ئاشنایەتی و بەرپرسیارێتی و چالاکی نواندن، کە ئەوانی لەتوندوتیژی دوور خستۆتەوە. هەر بۆیەشە لێرەدا، باڵدار بەوریاییەوە بابەتی کۆتایی ساڵ دەکاتە وانەی خۆشەویستی و ئەمەکداری، واتە لەڕێگەی ڕیوایەتکردنەوەی ڕابردووی هاوبەشەوە، ڕۆحی لێبووردەیی لەلای منداڵ پتەو دەکات، بێگومان ئەمەش ئەو خاڵە جەوهەرییەی پەروەردەیە کە ئێستا لەسیستەمی پەروەردەیی ئێمەدا بەتەواوی ونبووە، چونکە ئەوە خۆزگەی هەر قوتابی و فێرخوازێکە، زوو کۆتایی ساڵ بێت و ڕزگاری ببێت لەو پەیوەندیە گرژانەی کە دەیبەستن بەو شوێنەوە کە ناوی: قوتابخانەیە!

*           *           *

هەر چۆنێك بێت باڵدار بەداهێنانی ئەم بەرهەمە دەرگای جیهانێکی تایبەتی لەسەر منداڵیی هەموومان کردەوە. ڕاستە بەرهەمەکە هەندێ ناکۆکی لەخۆی گرتووەو کەموکوڕی هەیە کە لەخوارەوە بەکورتی ئاماژەیان پێدەدەم، بەلاّم چەندین نەوە لەکۆمەڵگەی کوردیدا (پۆلی یەکەمی سەرەتایی ژیانی خۆیان) لەم بەرهەمەوە دەستپێکرد.

لە کتێبەکەی باڵداردا، هەندێ ناکۆکی هەستیان پێدەکرێت کە دەمەوێ بەم شێوەیە ئاماژەیان پێبدەم:

-یەکەم ناکۆکی لە نێوان دەقەکان و ئەو نیگارانەدا بەرچاو دەکەوێت کە بۆ وانەکان کێشراون. لە کێشانی نیگاری جلوبەرگەکاندا، بەزۆری کەش و هەوایەکی مۆدێرنی شاریانە لەبەرچاو گیراوە، لەکاتێکدا کە شوێنی ڕوداوەکان لادێ و گوند و سروشتە. ئێمە ئێستا پاش چەندین ساڵ تێدەگەین، ئەو خانمەی نیگارەکانی کێشاون، کورد نەبووەو ئەوروپی بووەو بەهەمان بونیادی زەینی خۆیەوە تەماشای ژیانی کوردەواری کردووە کە شوێنی ڕووداوەکانی ناو ئەلف و بێی نوێیە. یەکێك لە خەسڵەتەباشەکانی ئەم ناکۆکییە ئەوەیە کە نیگارەکان بەهۆی جوانی ڕەنگ و گۆشەی ڕوانین (پێرسپێکتیف) و هێڵی ڕێك و... هتد، وە کەماڵێکیان بەخشیوە بە هەموو شتێك و ئەمەش وای کردووە، خەیاڵی منداڵ زۆر بەهێزتر بکەوێتە کار، لەوەی کە دەقە نووسراوەکان دەیخوازن.

ئەمە جگە لەوەی کە سروشت و دەوروبەر لەو نیگارانەدا ئەوەندە پاکژ دیارە، کە مرۆڤی بینەر نایەوێت بۆ ساتێك لێی دوور بکەوێتەوەو حەزی لە کۆپی کردنەوەو لە بەرا ڕەسمکردنەوەی تێدا دروست دەکات. (یەکێك لە ساتە وەختە خۆشەکانی منداڵیم ئەوەبوو، بەهۆی نەوتاوی کردنی پەڕەیەك کاغەزو دانانی لەسەر نیگارەکانی ئەلف و بێی نوێ، بکەومە خەتکێشانەوەی نیگارەکان و ڕەنگکردنەوەیان، ڕەنگە ئەمە یەکەمین مەشقکردن بووبێت بۆ فێربوونی قۆپیکردن و دزی و بە موڵکایەتی کردنیش!).

-ناکۆکی نێوان وێنەی جلوبەرگی قارەمانەکانی ناو ئەلف و بێ و دەوروبەری سروشتیان، دەمانباتە سەر ناکۆکییەکی تر، کە ئەویش خۆساغنەکردنەوەی باڵدارە لە نێوان کولتووری لادێ و کولتووری شاردا. ئایا باڵدار لە کوێی ئەم دوو کولتوورەدا وەستاوە و دەیەوێت لە ڕێگای بەرهەمەکەیەوە، نرخ و بەهای کامیان فێری منداڵ بکات؟

–ئەگەرچی ئەم کتێبە بەڕۆحێکی پەروەردەییەوە نووسراوەو دەقێکی سکۆلاریانەو عەقڵانیانەیەو لێرەشەوە زمانی ئاینی تیایدا ونە، بەڵام جەستە تیایدا ئامادەیی نیە، کە ئێمە دەزانین ونبوونی جەستەش پەیوەندی بەو سانسۆرەوە هەیە کە ئاین لە کۆمەڵگەی ئێمەدا لە سەر جەستە داینـاوە. بۆچی لەم کتێبەدا، جەستە وەك بابەتێکی پەروەردەیی و مەعریفی ونە؟ بۆچی وانەیەکی تێدانییە باس لە جەستەی نێرو مێ و جیاوازییەکانیان بکات؟ بۆچی پێمان ناڵێت ئێمە چۆن لە دایك بووین و لە کوێوە هاتووینەتە جیهانەوە و میکانیزمەکانی دروستبوونی مرۆڤێك کامانەن؟ بێگومان بەشێکی ئەم پرسیارانەش لەو قۆناغەی تەمەنی منداڵدا سەرهەڵدەدەن کە باڵدار کتێبەکەی ئاراستەکردوون و کەچی لە قۆناغی زانکۆیشداو لە وانەی ئەناتۆمی بەشی پزیشکیشدا، بێ وەڵام دەمێننەوە.

–ئەگەرچی لە کۆی وانەکانی ناو کتێبەکەی باڵداردا، دارا، بەوجۆرە دەردەکەوێت و دەناسێنرێت، تا ببێتە مرۆڤێکی نمونەیی و چاولێکراو، بەڵام پرۆسەی گەشەکردنی کەسایەتی (دارا) بەرەو شوێنی مەترسیدارمان دەبات. دارا لە زۆر شوێندا کاراکتەرێکی پێچەوانەی چاوەڕوانییەکان وەردەگرێت و لە هەندێك شوێنیشدا تەواو شەڕانی خۆی دەناسێنێ، بۆ نموونە: لە وانەی (تەیارە ل:٢٥) دا، دارا تەیارەکەی دەباتە ناو دارەکانەوەو ئەوانیتر هان دەدات بیدۆزنەوە تاکو ببێتە هی خۆیان، لە وانەی (ووس بە ل:٢٦)دا، دیسانەوە دارایە کە دەیەوێت ئازاد هان بدات بۆ دەرهێنانی تەیرەکان لە هێلانەکەیان.

لە وانەی (هێلکە ل: ٣٨) دا، نەسرین داوا لە دارا دەکات هێلکەیەکی بۆ بهێنێت، بەڵام ئەو دەیەوێت بۆی بهاوێژێ! هەروەها لە وانەی (کەڵەباب و قاز ل:٤٢)دا، دارا خەریکی بەشەڕدانی کەڵەباب و قازەکانە! ئەمە جگە لەوەی لەوانەی (گا بەڵەك ل: ٥٥)دا، بەناوی پاسەوانیکردنی گوڵەکانەوە دەیەوێت گوریس بکاتە ملی ئەو گایەی کە ئەو بە (بلح) ناوی دەبات. ڕاستە دارا لەهەموو وانەکاندا دارایەکی شەڕانی نیە، وەڵێ زۆربەی ئـ ـکانیزمانەی شەڕانیەتەی دارایان لەسەرەوە دروستبووە، لەکەسایەتی ئێمەدا ڕەنگیان داوەتەوە!

* * *

دوا جار دەتوانم بڵێم: ئەگەر چی پڕۆژەکەی باڵدار بەپلەی یەکەم پڕۆژەیەکی پەروەردەیی و فێرکاریانەیە، وەلێ لەوەدا کە ئەمە بەرهەمی دنیای هاوبەشی منداڵیی چەند نەوەیەکی مرۆڤی کورد بوو، توانی زۆر لەو ئامانجە سیاسیانەش بەدی بهێنێت کە شۆڕشەکانی کورد هەوڵیان بۆ دەدا.

باڵدار نەك لەڕێگەی سیاسەتەوە، بەڵکو لەڕێگای هوشیارکردنەوەو پەروەردەوە، شۆڕشی خۆی بەرپا کرد. بەم مانایەش ڕۆڵی ئەو کەمتر نیە لەڕۆڵی هیچ شۆڕشگێڕێکی دی سەدەی بیستەمی ئێمەی کورد، بەتایبەتیش لەسازدانی ناسنامەو زەمینەیەکی هاوبەشی گەشەکردنی عەقڵی لەسەر بنەمای یادەوەرییەکی بەکۆمەڵی، وازهێنان و بەلاوەنانی ئەو کتێبە، هیچ ناگەیەنێت جگە لەسڕینەوەی ئەو زەمینەیەی کە ناسنامەیەکی بەبوونی ئینسانیانەو کوردانەمان دەبەخشی.

بەبڕوای من کارکردن و مشتومالْ کردن و گۆڕانکاری لەکتێبەکەی باڵداردا، کارێکی پێویستە، بەڵام لابردن و پاسیڤکردنی، وەك ئەوەی لەلایەن هەردوو وەزارەتی پەروەردەی دوو ئیدارەکەی حکومەتی هەرێم و هەندێ ناوەندو کەسایەتی ئەکادیمییەوە کاری بۆ کراو، جگە لە (هەڵەیەکی پەروەردەیی)، هیچی تر ناگەیەنێت و ئەمەش دەریدەخات کە سیستەمی پەروەردەیی و هزری پەروەردەیی لەوڵاتی ئێمەدا، لەچ تەنگژەیەکدایە.

وا چاکە نەوەی ئێمە، لەڕێگەی خوێندنەوەی ڕەخنەییانەی ئەم کتێبەوەو بەدوور لەنۆستالیژیاو ڕابردوو پەرستی، نەهێڵێت (نیشتمانی منداڵییەکانمان) لێزەوت بکرێت و هێزی باڵگرتن و فڕینمان لێبسەنرێتەوە. لێگەڕێ ئەمەش جیاوازییەکی دیکەی نێوان ئێمەو ئەوان بێت.

# چەمکێك لە مێژووی سەرهەڵدانی ئەلف و بێی کوردی*

م/ ئەمین سەپان

دوو لایەنی غەیرە کورد، غەیرە موسوڵمان. لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمەوە ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە لەبواری وەرگێڕان و زمانەوانی نەتەوەیی کوردا، ئەوانیش ١-قەشە پاتریکە ئەرمەنییەکان Armeniens ٢-موژدەکارەکان Missionnirer، هەردوو لایەن یەکانگیری یەك مەبەست و هاوپەیوەندی جێبەجێکردنی بەرژەوەندی ئامانجەکانی خۆیان بوون، بەڵام بەم کارەیان خزمەتێکی گەورەی نووسینی کوردی و نەشونماکردنی ئەلف و بێو پەخشان و فەرهەنگۆکی کوردی لەقۆناغی سەرهەڵداندا کردووە.

یەکێك لەو کارە پڕ سوودانەی لێردا دەمانەوێت بەرەو مێژووی سەرهەڵدانی (ئەلف و بێ)یە کە مەبەستمانە لێی بکۆڵینەوە.

کتێبی (ئەلف و بێ)ی کرمانجی و ئەرمەنی بەدیالێکتی کرمانجی بە پیتی ئەرمەنی. کە لە ساڵی (١٨٦١)دا لە ئەستەمبوڵ بڵاوکراوەتەوە، یەکەم کتێبی قوتابخانەیە، یەکەم قاموسی کوردی-ئەرمەنییە، یەکەم کتێبی وێنە دارە بەزمانی کوردی، یەکەم هەوڵدانی داڕشتنی ئەلف و بێیە بەزمانی کوردی.

(ئەلف بێ)ی سورەیانیش Syraque بۆ نووسین بەزمانی کوردی ڕەگ و ڕیشەیەکی لەساڵەکانی ١٨٨٨ز کۆنتری هەیە. هەردوو (ئەلف بێ) کە پتر بۆ ئاسانجی دینی واتە بۆ بڵاوکردنەوەی دینی مەسیحی بەکارهاتووە موژدەکارەکان کاتێ هاتنە ڕۆژهەڵات.. زانییان زۆربەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات بە پیتی عەرەبی دەنووسن و جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ پیتی لاتینیدا هەیە بۆ یەکەوتنە هێنانی چاپخانەیەك بۆ شاری حەلەب لە سوریا کە بە یەکەمین چاپخانە دەژمێررێت لەو سەردەمەدا. بەمە ئەم (پاتریار)ە خزمەتێکی چاکی بەزمان و بڵاوبوونەوەی نووسیندا بەپیتی عەرەبی.. کوردیش وەك هەموو نەتەوە موسڵمانەکان زانایان و مامۆستایانی ئاینی کەوتنە نووسینی کتێبە ئاینیەکان کە یەکەمین تێکستی لەم جۆرەش بریتیە لەمەولودنامەکەی (شێخ حسێنی قازی) (١٧٩١-١٨٧٠)، کە بەدیالێکتی سۆرانی لە ساڵانی ١٨٦٠دانووسراوە بە شیعر و پەخشان.. لەهەمان سەردەمدا مەولانا خالدی نەقشبەندی (١٧٧٩-١٨٢٧) تێکستی دینی بەناونیشانی (عەقیدە نامەی کوردی) دەخاتە ڕوو.

ئەمە جگە لە (مەسنەفی ردشی) کتێبی یەزیدیەکان کەوا پێش بینی ئەکرێ لەسەردەمی ڕێبەری یەزیدیەکانەوە (شێخ ئادرێ) ١٠٧٣-١١٦٢ نوسرابن و بڵاو کرابنەوە، کەواتە ئەم دوو چاوگە لە (مەسیحیەت و ئیسلام) لە سەدەی نۆزدەهەموو پێشتریش سەرچاوەی نووسینی کوردی بوون، زەمینەیەکی بنچینەیی بەبڕشت بوون بۆ سەرهەڵدانی نووسین بە (ئەلف بێ) ی کوردی.

لەناو کوردە جوامێرەکانی سۆڤیەتدا (ڕوسیا) (ئەرەبی شەمۆ) یەکەم کوردی کۆمەنیست و دانەری (ئەلف بێ) ی کوردی بوو کە ١٥ ساڵ لە ناوچە بەستەڵۆکەکانی پۆڵی سەرو توندکرا... ئەمکارەش پڕ بەپێستی ئەو سنوورە داخراوەی تیایدا لەدایك بوو دەوری خۆی بینی لەبەرەو پێشچوونی (ئەلف بێ) ی کوردیدا.

لە ئەرمینیاش یەکسەر دوای دامەزراندنی حکومەتی سۆڤیەت کۆمیتەی ڕۆشنبیری ئەرمینیا شارەزایانی بانگێشت

* هەرێمی کوردستان ژ ٢٧٤/ بەرواری٢٠٠١/٤/٤

کرد بۆ دانانی ئەلف و بێی کوردی دوای چەند مانگێك "گازاریان" کە بە "لاز" ناسرابوو لەسەر پیتی ئەرمەنی ئەلف و بێی کوردی دانا شارەزایان و ڕۆشنبیرانی نەتەوەکەمان لەسەرو هەموویانەوە شاعیرە بلیمەتەکانمان کەوتنە هاندانی میللەتەکە بۆ فێربوونی خوێندەواری..

لەوانە (ئەلف بێ) کەی بەڕێز (ئەحمەدعزیز ئاغا) لە بیستەکان و بەڕێز حامد فەرەج لەبیستەکاندا گەڵ هەوڵ و تەقەلای دڵسۆزانەی تر کە هەر هەمووی هۆکاری سەرەکی بوون بۆ بەرەو پێشچوون و بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندەواری.

(ئەلف وبێی نوێ) ی (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)یش کە ئێمە لێرەدا مەبەستمانە لێی بدوێین کە بەشاکاری هەموو بەرهەمەکانی پێش خۆی و دوای خۆی دادەنرێت ئەم باسە فێربوونی زمانی کوردیدا بە لاتینی و د. کاوس قەفتان و د. فەرەیدون قەفتان لە دانانی ڕۆژژمێری کوردیدا بە پیتی لاتینی دەوری بەرچاویان بینیوە، دانانی ئەلف بێ یەك بۆ قۆناغی بنچینەیی لە لایەن بەندەوە دوا هەوڵیش مامۆستا (ڕێزان مەجید شەریف) داویەتی بۆ دانانی ئەلف و بێ یەکی پێشکەوتوو کە بەتەمایە پێشکەشی وەزارەتی پەروەردەی بکات بە هیواین سەرکەوتووبێت، هەوڵو ماندوبونی مامۆستای بەڕێز (عەبەسور)یش لەم دوو ساڵەی دواییەدا بەمەبەستی گەلاڵەکردن و چاپکردنی ئەلف بێ یەکدا و خوێندنی بە ڕەسمیی لە ساڵی خوێندنی ٢٠٠٠-٢٠٠١دا..

لێرەدا هەڵوێستەیەك دەکەین و دەچینە خزمەت باڵدارو (ئەلف و بێ)کەی ئەو بەڕێزو مامۆستایانەی پەنجا ساڵە باڵدارو (ئەلف بێ)کەی لە خزمەتیاندان ئێستا (لەعەلی ئەدون) دەیانەوێت بەپێشەکییەکی سادەو ساکار ڕۆحی باڵداری پێ شاد بکەن و ئێمەی وەفاداریشی پێبخەڵەتێنن، باڵدار ئەو پەپوولە دڵ ناسکە کەم دووەبوو کە لە جیهانێکی پڕ لەوەفاو خۆشەویستی نیشتمان و گەلدا دەژیا، ئەوانەی لە باڵدار نەگەیشتبوون بە مرۆڤێکی کەم هۆشیان دەزانی.. کاتێ بەزمانە پاراوەکەی باس و بابەتە پەروەردەییەکانی پێشکەش دەکرد، ئەوە ڕوون دەبووەوە کە باڵمان بەقەد کەڵە پیاوی وادا نایەتەوە ئەگەر بمانەوێ لە بایەخی بەرهەمەکانی کەم بکەینەوە، ئاسنی سارد دەکوتین.



دەخەینە دواوە بۆ ئەوەی بەتێرو تەسەلی لێی بکۆڵینەوە.

دوابەدوای ئەم هەوڵە دڵسۆزانە مامۆستا تاهیر صادق لە کەرکوك (ئەلف بێ)یەکی خستە پێش چاوی مامۆستایان... مامۆستا کەریم زەند و محەمەد عەبدە، فوئادصراف و مامۆستا شێرکۆ ئەحمەد شەوقی و مامۆستا مستەفا نەریمان و کاك ئومێدئاشنا و مامۆستا نوری عەلی ئەمین و ڕێکخراوی قەندیل و کۆمەڵەی ڕۆژ. د. محەمەد و دادە سۆزان عوسمان هەرهەموو دەستیان لەم بوارەدا دیارە، بەڕێزان جلادەت بەدرخان و هەموو ڕۆشنبیرانی بەدرخانیەکان لە ئەستەمبوڵ و میسرو سوریەدا ڕۆڵی سەرەکیان بینیوە گیو موکریانی و عەزیز عەقراوی لە

(وەفاو دڵسۆزی) دوو بنەمای سەرەکی بواری پەروەردەو خوێندنن ئەگەر ڕاستەوخۆ کارنەکەنە سەر گۆڕانکارییەکانی ژیانی مرۆڤ ڕووبەڕووی ئەو پێشهات و بۆچوونانە نەبنەوە کە پێچەوانەی پێشەنگی خزمەت گوزاریی و ڕابەری نەتەوەکەمانن.. ئەوە هەر لە پیشەی لاری ئێمە دەوەشێتەوە، نمەك نامان گرێت و بەزوویی پێشەواو زاناو قارەمانانی نەتەوەکەمان بیر ئەچێتەوە..

ئەبێ (ئەلف و بێ)ی باڵدار چی لە (خلدونیە)ی (ئەبو خلدون) کەمتر بێت ئەگەر قورئانی پیرۆز نەبوایە کاریگەرێکی ڕاستەوخۆی نەکردایەتە سەر ناوبراو نەبوایەتە سەرچاوەو چاوگ ئەو (خەلدونیە) بەو پوختەییەی لێ نەدەهاتە بەرهەم کە ١٠٠ ملیۆن عەرەب شانازی پێوە ئەکات.

ئەو "ئەلف و بێ" شیعر ئامێزەی باڵدار کە ڕەچاوی هەموو بنەما ڕەسەنەکانی پەروەردەیی تیاکراوە لەڕووی ڕواڵەت و ناوەڕۆکەوە، لەڕووی ڕیزکردنی بیستەکانەوە لە ئاسانەوە بۆ گران، لەدیارەوە بۆ نادیار، پێشخستنی ئەو پیتانەی کە لەسەرەتاو ناوەڕاست و کۆتایدا) وەك یەك دەنووسرێن،، تێکەڵ کردنی هەموو ڕێبازەکانی وانە وتنەوەو گرنگی دان بەڕێگای دەنگ، بەستنەوەی بابەتەکان بەژیانی ڕۆژانەی منداڵ و دەوروبەری، داڕشتنی بابەتەکان لەڕادەی تێگەیشتنی منداڵداو گرنگی دان بەزمانی حاڵی منداڵ، ناسینەوەی ئەندامانی خێزان و کەل و پەلی ناوماڵ و گیاندارە ماڵیەکانی دەوروبەریان.. شارەزابوونی یارییە فۆلکلۆرییەکان و چەسپاندنی گیانی خۆشەویستی و وەفاو دڵسۆزی و بەزەیی لە دەروونی قوتابیانداو دوورکەوتنەوە لەکارە دزێوەکان و ناسینەوەی ڕەنگ و دەنگی پیتەکان لەسنووری وشەی دەرەوەو ناوەوەی بابەتەکاندا.. هتد.

ئەم بەرهەمە مەزنە ئەم ئەلف و بێ بەسوودە کەم ماڵ هەیە میوانداری لێ نەکردبێ‌و لە ئامێزی نەگرتبێ لەخانەی سەرەوەی کتێبخانەکەیدا جێگای بۆ نەکردبێتەوەو وەك بیلبیلەی چاوی نەیپاراستبێ!!

بابەتە بە پێزەکانی بونەتە وێردی سەر زمانی گەورەو بچوك هەتا منداڵانی باخچەی ساوایانیش بەو دەنگە ناسکە بەجۆشەیانەوە بە ئاوازێکی دڵ ڕفێنەوە بابەتەکانی دەڵێنەوە، پەنجە نەشمیلەکانیان لەسەر وێنە ڕازاوەکان دادەنێن بەبێ ئەوەی پیت و وشەکان بناسنەوە بابەتەکان وەك کورتە چیرۆکێك دەگێڕنەوە.

ئەم ئەرکە گەورە ئەم پەیامە پیرۆزە ئەم بەهرە یەزدانییە باڵدار هۆکاری هەڵگری ئەو پەیامە بوو بە ئەمانەتەوە گەیاندیە نەتەوەکەی مەگەر (جامی ئەجەل) ئەم (ئەلف و بێ)یەمان لەبیر بەرێتەوە...

ئێمە ئەگەر بمانەوێ بەرهەمەکانی باڵدار هەڵسەنگێنین پێویستمان بە ١٠ لاپەڕەی ڕۆژنامەیەك هەیە بەتایپی ورد.. کە لەدوو توێی ٨٠ لاپەڕەی قەوارە گەورەدا لام کۆبۆتەوە ئەوەی کە زۆر پێویستە دوو خاڵە.

١-دەوترێت ناو بەناویش بزەیەك دەکەوێتە سەر لێوی کۆمەڵێك مامۆستا کە ئەوان بڕوانامەکانیان لە ئەودەمەی مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدار گەورەترە. باڵدار کاتێ ئەو کتێبەی داناوە مامۆستای دەورەی ریفی بووە.. پرسیار دەکەین؟

أ-باڵدار توانیبێتی بە بڕوانامەی (مامۆستایی ریفی)یەوە ئەم بەرهەمە بەسوودە دابنێ بۆ مامۆستایانی (دار المعلمین العالی)پەیان پێ نەبرد؟ بۆ دکتۆرێکی دانیشتگە دوای نیوسەدە ڕەخنەیەکی بەجێی لەڕووی تێکەڵی بۆنیاتی ناوەڕۆکی کتێبەکەوە نەگرت؟ پەنجا ساڵی ڕەبەقە زمانەوانان و مامۆستایان و پسپۆڕانی پەروەردە خەریکی موتوربە کردنی وشەو تێهەڵکێش کردنی ڕستەو ئەم دیوو ئەو دیوکردنی بابەتەکانن ئایا گەیشتنە ئەو باوەڕەی ئەم ئەلف و بێیە کەڵکی خوێندنی پێوە نییە؟

ب-باڵدار بووە فەیلەسوف و زانای بەتوانای پەروەردە... پێمان وت کە ئێستا قاڵبووی بواری دەروونی منداڵ و زانستیت بۆ پیاچوونەوەیەك بە بابەتەکانی (ئەلف و بێ)دا ناکەیت؟ لەوەلامدا فەرمووی: (ئەو سەردەمەی من ئەو کتێبەم کردە خەڵات بۆ نەتەوەکەم لەناو واقیعی کارەکەدابووم دەردەداربووم (هەزار حەکیم بەقەدەر دەردەداری نازانێ) ئەو ئەلف و بێیەم کردە دەوای هەردوو بەشە سەرەکییەکەی خوێندن کە مامۆستاو قوتابییە.. ئەوەی ئەتوانێ وشەیەك یا ڕستەیەکی بۆ زیاد بکات ئەوەش باڵدارێکە بۆ خۆی ئەوەشتان لە بیر نەچێ ئەم ئەلف و بێیە زمانحاڵی منداڵ و قەواڵەی بەختی نەتەوەکەمە، ئەوەی دەیەوێ باڵدار بناسێ با (ئەلف وبێی نوێ) بخوێنێتەوە...

بەم پێیە ئەو ڕایە پوچەڵ دەکرێتەوە کە باڵدار بواری نەداوە دەستکاری کتێبەکەی بکرێ یان کتێبێك دابنرێ و ئەو ڕێگای لێبگرێ و بەرهەڵستی کردبێت، ئەمە واقیعەو کەس ناتوانێ نکوڵی لێبکات ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی زانست و پەروەردە کارێکە کەس ناتوانێ بەرەنگاری بێت (بەری ڕۆژیش بە بێژنگ ناگیرێت).

٢-پێیان وایە تەمەنی ئەلف بێی باڵدار نیوسەدەیە ئیدی ئەود کۆن بووە دەبێت گۆڕانکارییەکی تێدا بکرێت کتێبێکی

نوێ جێگای بگرێتەوە. ئاشکرایە لای هەمووان هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی و مێژوویی و پەروەردەیی کۆن و نوێی نییە، چاك و خراپی هەیە.

ئەگەر بە ویژدانەوە بمانەوێت ئەلف بێی باڵدار هەڵسەنگێنین دەبێت: زاخاوی بدەینەوە، بە وشەو ڕستەی گونجاو لەگەڵ بارودۆخی ئەم سەردەمەدا موتوربە بکرێ.. باڵدارمان بە مردوویی خستە ژێر خاکەوە وەك پێویست لە مستەوای ئەو پرۆفیسۆرەدا لە ئەسپەردەکردن و پرسەو چلەکەیدا کارێکی وای بۆ نەکرا ڕۆحی باڵداری پێ شاد بێت و نەبێتە مایەی شەرمەندەیی بۆ ئێمەی قوتابی ئەو ڕێبازە پیرۆزە.

زیندە بەچاپ کردنی کتێبی (ئەلف و بێ) کەشی زوڵمێکی کەیە لە باڵدار و لە پرۆسەی خوێندن و پەروەردە دەکرێت.

ئەم گۆڕانکارییە لە دوو خاڵی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە:

أ-یا ئەوەتا ئەلف بێ نوێیەکەی بەڕێز (عەبە سوور) سەرکەوتووە و لێژنەیەکی پسپۆڕ تاووتوێی کردووە، ڕای گرۆیەك مامۆستای لەسەر وەرگیراوە، خراوەتە پێش چاوی خوێندەواران ئەوەی دەنکە بادەمێکی پەروەردەی خواردووە بینیویەتی.. وەزارەتی پەروەردە ڕەزامەندی نیشان داوە جەختی کردووە دەبێت لە ساڵی خوێندنی (٢٠٠٠-٢٠٠١) دا بخوێندرێت ئیدی پێویست ناکات پاش ڕەزامەندی بەسەر بەرهەمەکەدا هەوڵ بدەن، کاتێ بەراورد و هەڵسەنگاندن دروستە کە بەرهەمەکە لەژێر چاودێری و تاقیکردنەوەدا بێت.. ئەمن کە خاوەنی ئەلف بایەکی ساڵانی هەشتام لەسەر بنەمای ئەلف و بێی باڵدار بۆ قۆناغی بنچینەیی قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری (مرحلە الاساس المحو الامیە)، ئەمساڵی من مافی ئەوەی نییە لە لاپەڕەی ڕۆژنامەکاندا ئەلف و بێی باڵدار لەکەدار بکات... کارێکی سروشتییە ئەوانەی لە خوانی خامەی پەروەردەوە نزیکن لەبەر دڵانن، ئێمەش کە دەهۆڵ بۆ ئەلف باکەی باڵدار دەکوتین با سیر بخۆین و زورنا لێ بدەین.. کە دەفمان دەنگ نەدا بەردی خۆمان نەدەین لەسنگ.

ب-یا لەڕاستیدا بەرهەمەکەی باڵدار تا ئێستاش سەرچاوەیەکی ڕوونە تینویەتیمان لێشکاندووە نابی بەردی تێ فڕێدەین.. چرایەکی ڕوناکە لە تاریکی شەوەزەنگی نەخوێندەواری ڕزگاری کردوین تا ئێستاش تروسکە هیوای بواری پەروەردەو خوێندنە.. نابێ وازی لێبهێنرێت.

کۆمەڵێك مامۆستای بەڕێزیش گەلاڵەی چەند ئەلف بایەکیان کردووە... دوو بابەتیان بەپێی ڕێ و شوێنی پیتەکان لە یەك بابەتدا کۆکردۆتەوە لەسەر بنەمای ئلف و بای باڵدار وەك مامۆستا ڕێزان مەجید شەریف، مامۆستا سەعید صالح عومەر لە هەولێر، ئەلف بێ باڵداری دەقاودەق نووسیوەتەوە و دوو بابەتی کردۆتە یەك و هەندێ ناوو وشەی لە سنووری پیتە خوێنراوەکاندا تێهەڵکێش کردووە... لە دهۆکیش دوو مامۆستای بەڕێز دەستکاری ئەلف و باکەی باڵداریان کردووە بە وشەو ڕستەی لەبار مووتوربەیان کردووە لەگەڵ لەهجەی بادینیدا بگونجێ و هەندێ وشەشیان لێ لابردووە کە لای ئەوان نامۆیە... بەڕاستی زانستیانە بۆ مەسەلەکە چوون بەڵام تا ئێستاش مۆرکی ئەلف و بێکەی باڵداری پێوە دیارە بەهیچ جۆرێك دەسکاری بونیاتی کتێبەکەیان نەکردووە، ئەمە چەمکێکە لە مێژووی دروست بوونی ئەلف و بێی کوردی ئەگەر بمانەوێ بە وردی بچینە بنج و بنەوانی ڕێنووسی کوردی لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا کارێکی ئاسان نییە.. مەبەستی سەرەکیمان پێناساندنی سەرەتایەکی ئەلف بێیە بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ نەچینە ناو هەوڵ و تێکۆشانی ئەلف بێکەی باڵدار و ڕۆڵی گەورەو بەرچاوی لە بواری پەروەردە و فێرکردندا.

بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١-گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق / دەستەی کورد بەرگی هەشتەم ساڵی ١٩٨١ لاپەڕە (١٩٩)-(٢٢٢) محەمەدی مەلا کریم.

٢-ئینجیل لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا د. فەرهاد پیربال ١٨٥٧-١٩٥٧.

٣-خوێندنەوەی کوردی ڕێکخراوی قەندیل و کۆمەڵەی ڕۆژ لە تورکیەوە وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی.

٤-ئەلف و بێ باڵدار چاپی ٢٣ساڵی ١٩٨٠هەموو ژمارەکانی کە.

٥-کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە محەمەدنوری تۆفیق.

٦-ئەلف بێ موتوربەکراوی ناوچەی بادینان.

٧-پەیوەندی نێوان کوردوڕوسیا (ئارام عەلی)ستۆکهۆڵم ساڵی ١٩٩٩.

# تەنها بەلای بێگانە پەرستانەوە (ئەلف و بێ) یەکەی (باڵدار) کتێبێکی (پیرۆز) نییە!

( حسین بەفرین )

هەرچەند کورد مێژووی کۆنە و پێش گەلانی دەوروبەری خۆی دەوڵەتدار بووە بەڵام تووشی تێکشکان هاتووە و بووە بە دیل و ژێر دەستی گەلان و بە هۆی هەندێك هۆوە ماوەتەوە و لەناو نەچووە، کە گرنگەکەیان زمانە چونکە کورد زمانی قسەکردن و نووسینی یەك شتە هەرچەندە ئەو زمانە وەك زمانی گەلان زۆر لە مێژ نییە نووسراوی پێنووسرابێت، بەڵکو بەزۆری لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامە و قوتابخانەوە وردە وردە نووسینی کوردی دەستی پێکرد و هەوڵ درا ڕێنووسێك بۆ دەربڕین دابین بکرێ. ئەگەر وردتر بچینە ناو باسەکەوە ئەبینین لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا لەم شاری سلێمانییەدا چوار قوتابخانەی کوڕان و یەك قوتابخانەی کچان هەبوو کە (٣٣٤) کوڕ و (٨٥) کچی قوتابی هەبوون و لە قوتابخانەکانی کوڕاندا تەنها چواردە مامۆستا و لە کچان چوار مامۆستا هەبوون و لەساڵی ١٩٢٧ دا یەکەم قوتابخانەی ناوەندیش کراوەتەوە تەنها دە قوتابی تیا بووە لەو ساڵەشدا قوتابخانەی (زانستی)یش کراوەتەوە. گرنگترین کتێب کە لەو یەکدوو ساڵەدا دەرچوون کتێبی (مختصر صرف و نحوی کوردی) لە ساڵی ١٩٢٨ لە لایەن (سەعید صدقی) و کتێبی (ئەلفبای کوردی) لە ساڵی ١٩٢٦ لە لایەن (ئەحمەد عەزیز ئاغا) وە بوون، کە بۆ نموونە لەسەر پیتی (ل) ئەڵێ: (لطفا ئەو قەڵەمەم بدەرێ، ذاتا چاوم پێ ئەکەوێت... هتد). دوا بە دوای ئەو مامۆستا (حامد فەرەج) لە ساڵی ١٩٣٦ دا کتێبێکی بە ناوی (ئەلف و بێی کوردی) دانا کە ئەم کتێبە لە ڕووی گەشەکردنی زمانی کوردییەوە دەسکەوتێکی ئەقڵی بوو بۆ نموونە لەسەر پیتی (ڕ) ئەڵێ: (ڕاو ڕوو ڕوو ڕاو ڕاو ڕوو... هتد) تا کاتێك (باڵدار) هات ئەمە ڕێگای خوێندن و فێرکردن بوو کە ئەو هات دەستی گۆڕان کەوتە زمانی کوردییەوە وەك (باڵدار) بۆ خۆی ئەڵێ: (دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، وە کەڵك وەرگرتن لە بەرهەمەکانی گەلێك لە شۆڕەسوارانی ڕۆشنبیرانی کورد، کە لە پێشتر هەوڵێکی باڵا و پڕ بایەخیان داوە بۆ گەشەپێدانی نووسینی کوردی وەك: نوسینە درەوشاوەکانی بەڕێز (سەعید صدقی کابان) لە کتێبی (مختصر صرف و نحوی کوردیدا ١٩٢٨)وە بیر و باوەڕە نایابەکانی مامۆستای بەنرخ (تۆفیق وەهبی بەگ) لە کتێبی (دەستووری زمانی کوردیدا ١٩٢٩)، وە بەرهەمی مامۆستای بەڕێز (حامد فەرەج) لە کتێبی (ئەلفوبێ ی کوردیدا ١٩٣٦)، وە نووسەر دوای ئەو هەوڵانە بۆ گەیشتنە ئەوەی کە ئەو گیروگرفتانەی ڕێنووسی کوردی کە لە ئارادا بوون، وە بەلایەوە سەرەکی بوون بەم جۆرەیان چارەسەر بکات:

کە کتێبە (ئەلفوبێ)یەکە تەواو بوو، وە لەلایەن وەزارەتی مەعاریفی ئەو دەمەوە، لە ساڵی ١٩٤٩ دا بڕیار لەسەر چاپ کردنی و خوێندنی درا، زۆری ئەو شێوە پیتە نوێ یانە کە تیا بەکارهێنرا بوو لە چاپخانەکانی ئەو ڕۆژانەدا دەست نەئەکەوتن. لەبەر ئەوە وا بەباش زانرا، کە کتێبەکە بە دەست خەت بنووسرێتەوە، وە وێنەکانی ڕەسم بکرێت ئینجا وەك کلێشە لە چاپ بدرێت) لەم قسە جوانانەی (باڵدار)دا ئەوە

دەرئەکەوێ کە ئەو بە شانازی‌یەوە دریژە دەری خەڵکانی پێش خۆیـەتی و ئـەو کارانـە تـەواو ئـەکات کـە ئـەوان بـە کـەم و کورتی‌یـەوە جێیـان هێشتووە، هـەروەها ئـەوەش دەرئەکـەوێت کـە ئـەو کەسـێکی لـە ڕادە بـەدەر خـەمخۆر بـووە تـا ئـەو کـارە ئەنجام بدات کە قۆناغێکی مێژوویی بە سەریدا داوە بۆ ئەوەی بیگەیەنێ بەنەوەکانی دوای خۆی بۆ جێبەجێکردنی کارێکی ئەوتۆش (ئیبراهیم باڵدار) تەواو کەسێکی بە ئاگاو شارەزا بووە بـە هـەموو کـەلێن و قـوژبنێکی ڕۆشـنبیری سـەردەمی خـۆی و بەرنامەیـەکی ڕوونـی بـە دەستەوە بـووە بـۆ ئەنجامدانی لەگەڵ ئـەوەی نووسین بە زمانی کوردی بەرهـەمێکی ساوا بووە و تا ئەو کاتەش کە ئەو باسـی لێوە ئەکات تەمەنی ٢٠ تا ٣٠ ساڵ زیاتر نەبووە، بەپێی ئەو تەمەنە کەمەی نووسینی کوردی ئەو کارانەی (باڵدار) و کەسانی بەر لە خۆشی کردوویانە بەڵگەی زیرەکی و توانای ئەوان دەرئەخات، هەر لەو بارەیەوە (باڵدار) ئـەڵێ نووسـەر: (بـۆ جاری دووەم لـە سـاڵی ١٩٥٣ دا کتێبێکی (ئەلف و بێ)ی نوێی دانا، کە لەسەر شێوەیەکی پێشکەوتووتر ڕێکی خستبوو، ناوی نا (ئـەلف و بێـی نـوێ بـۆ منـداڵان). ئـەم کتێبـە لەلایـەن هونەرمەنـد (بـەدیع باباجـان)ەوە بـە وێنـەی ڕەنگاوڕەنگی جوانی کوردەواری ڕازێنرایەوە).

ئێـستا مـن ئەمـەوێ بـەپێی ئـەم دەرفـەتی نووسـینە وەك بیرێکی ڕاگوزەر بەسەر دوو جۆرە چاپی ئەو (ئەلف و بێ)یەدا بڕۆم و هەندێك دەرس لـە هـەردوو چاپەکەدا بەراوورد بکـەم بۆ ئەوەی لامان ساغ ببێتەوە تا چەند جیاوازی لە نێوان ئەم چاپی ١٩٥٣دا و چاپی ١٩٩٨دا هەیە کە ماوەی نێوانیان چل و پێنج ساڵێك ئەکات، لەو جیاوازیەدا ئەگەر بوو دەرئەکەوێت کارەکەی (باڵـدار) وەك بەرهـەمێکی سامانی نەتـەوەیی بـەهای مێـژوویی خۆی چەندە خۆ ئەگەر جیاوازیەکی ئەوتۆشی نەبوو ئەوە خۆی بۆ خۆی (پیرۆزیی) ئەو کتێبە دەرئەخات.

چاپی ١٩٥٣ وەها دەرسی یەکەمی دەست پـێ ئـەکات (دارا، دارا، دار، دار) بەڵام لە چاپی دوای ئەودا بۆ ئاسانکاری کراوە بەسـێ بەشـەوە لـە بەشـێکی‌یاندا (دار، دار، دار)وە لـە بەشـی دووەمدا (دارا، دارا، دارا)یـەو لـە سێیەمدا (دارا، دارا، دار، دار) بە ڕای من هەردوو ڕێگاکە ڕاستن و جیا نین بـەڵام ئـەوەی هەیـە هـی دووەم کـات زۆرتـر ئـەکوژێ. لـە دەرسـی (دوو)دا هـەروەك یـەکن. لـە دەرسـی (سـێ)دا هـەروەك یـەکن بـەڵام لـە ١٩٥٣دا (وشـەی داو) سـێ جـار دووبـارە کراوەتـەوە. لـە دەرسـی (٤)دا جیاوازیەك هەیە کە بەم جۆرەیە لە ساڵی ١٩٥٣دا وتـراوە (دارا دوو داری دی، دوو داری دووری دی دارا) بـەڵام لـە دوای ئـەو چـاپە وەهایـە: (دارا دوو داری دی، دوو دار، دوو داری دوور دوور) کـە ئـەوەش جیـاوازی ناگەیـەنێ وەك خۆشـکردنی ئیقاعێکی شیعری لێ هاتووە. لە دەرسی (٥)دا هەردوو لا وەك یەکن. لە دەرسی (٦)دا لە چاپی ١٩٥٣ دا وەهایە: (دەی، دەی، زارا، وەرە وازی، زوو وەرە، زوو، دەی، دەی) کـە ئـەم دەرسـە لـە چاپی دواتـردا نی‌یـە و لابـراوە. لـە دەرسـی (٧)دا جیاوازی‌یەکی بچووك هەیە ئەویش بەم جۆرەیە لە هی ساڵی ١٩٥٣دا وەهایـە: (دۆ، دادە، دۆ، وەرە دارا، دەی دەی، وەرە. دادە دۆی زۆرە) بەڵام لـە چاپی دواتـردا وەهایە (دادە، دۆ، دۆ، وەرە دارا، وەرە، دادە دۆی زۆرە، دەی، زوو وەرە). لـە دەرسـی (٨)دا جیاوازی هەیە لـە چاپی ١٩٥٣ دا بەم شێوەیەیە: (ئای، ئای، ئـەوە دۆی دادە ئـاوی زۆرە دۆی دادە ئـۆی، ئـۆی، دارای ئازا، دۆ ئاوی ئاوی وا زۆرە) بەڵام چاپی دواتر وشە زیادەکان لابـراون و وەهـای لێهاتووە: (ئای، ئای، دۆی دادە ئاوی زۆرە، ئـۆی، ئـۆی، دارا، دۆ ئـاوی وا زۆرە) کەچـی بـەو لابردنەشـی ماناکە هەر وەك خۆیەتی و نەگۆڕاوە.

دەرسـی (٩) لـە چـاپی ١٩٥٣دا وەهایـە: (دادە، دادە، وەرە دەرێ، ئەوە ئازادە، دۆی ئەوێ، ئـێ، ئـێ، ئـێ ئـەوا دێ، دادە وا دێ) لە چاپی دواتردا (ئێ ئەوا دێ) لابراوە وەك شتێکی زیایە. دەرسـی (١٠)یـش لـە چـاپی ١٩٥٣دا بـەم شێوەیە یـە: (زەردە، زەردە، وا ڕاوە، ئـەدەی، ئـەدەی، وا ئـازاد ڕۆی، وەو وەو، وەو ئای زەردە دڕە، وا ئەوەڕێ) لە چاپی دوای ئەودا بـەم جـۆرەی لێهاتووە: (زەردە، زەردە، وا ڕاوە، دەی، دەی، وا ئازاد ڕۆی، ئـۆی، زەردە دەوەڕێ. زەردە دڕە. زەردە زۆر زۆر دڕە). لـە دەرسی (١١)دا ڕستەی (وەرە ژوورێ ئازاد، وەرە ژوورێ)ی چاپی ١٩٥٣ دواتـر کـراوە بـە (ئازاد، ئازاد، وەرە ژووورێ) هـەروەها لـە چاپی دواتـر (دەڕژێ) خراوەتـە سـەر ڕستەی ( ئـۆی، ئـەوە دوو ڕۆژە) هەروەها ڕستەی (دۆی دادە وا ئەڕژێ) بووە بە (دوو ڕۆژە دۆی دادە دەڕژێ). ئەمـەش بەڵگـەی جیـاوازی نی‌یـە بـەڵکو خۆشـکردنی ئیقـاعی مۆسـیقایە. دەرسـی (١٢)ش گـۆڕانێکی بچووکی تیایە ئەویش ڕستەی (ئای ئەوە زریزەی ئازادی دیوە) بووە بە (ئای، ئەوی زریزەی دیوە، زریزەی ئازاد؟) هـەروەها لـە

ڕستەی کۆتاییدا وشەی (ئەوە) بووە بە (ئازاد). بەڵام دەرسی (١٣) لە چاپی ١٩٥٣دا وەهایە: (ئای، زارا، وەرە ئێرەوە، وا ژێرەوەی ئەو دارە درێژەی ژووری ئێوە درزی داوە، ئای، ئای، وەرە ئێرەوە، وەرە) کەچی لە چاپی دواتردا وەهایە: (زارا، وەرە ئێرە وا ئەو دارە درێژە ڕوواوە، دەی زارا، زوو وەرە، ئەو دارە درێژە وا ڕوواوە). لە چاپی ١٩٥٣دا دەرسێ هەیە بەم جۆرە: (دایە، دایە، ئەوە دارایە، وادیارە، ئەی، ئەی، دایە، ئەوە دارایە، ئەوا دوور دوور دیارە، وا دێ) بەڵام لە چاپی دواتردا خراوەتە دەرسەکانی کۆتاییەوە بە ناوی (کۆلارە)و دەسکاری زۆر کراوە. لە دەرسی (١٤)دا ڕستەی (ئەوە زارا و ئازادن، وا دێن) کراوە بە (زارا و ئازاد دەڕۆن) هەروەها ڕستەی (زارا و ئازاد ئاویان دەدەن) بووە بە (زوو زوو ئاو دەدرێن). لە دەرسی (١٥)دا ڕستەی (وا ئەڕۆینە ناو ئەو ڕەزەوە، دار دێنین، ئەیان ڕوێنین) کراوە بە (وا دەڕۆینە ناو ئەو دارانە. دەڕۆین دار ئەڕوێنین) هەروەها (نازنار) بووە بە (نازێ). لە دەرسی (١٦)دا وەها باسکراوە: (ئەوا دوو دارم ڕوواند، دایە. وەی، وەی، نازدارم، وەرە، وا ئەڕۆینەوە.

وا دێم دایە، وا دێم، وا ئەم دارە ئەڕوێنم، دوای ئەوە دێم) بەڵام لە چاپی دواتردا وەهای لێهاتووە: (دایە، وا ئەم دوو دارە دەڕوێنم، دوای ئەوە، ئاویان دەدەم. وەرە نازێ، وەرە، وا دەڕۆین، زوو وەرە. وا دێم دایە، ئەم دوو دارە دەڕوێنم، دوای ئەوە دێم).

لە دەرسی (١٧)دا وا هاتووە: (ما، ما، ما، ئۆی، ئۆی، مەڕە زەردە، وەرە مەمەمان ئەوێ، مەمە، مامە، مەمە، ئەوە مەڕە زەردەیە، من دۆزیمەوە مامە، وا مەڕە زەرد دێنمەوە و دێمەوە). لە چاپی دواتری ئەودا وای لێکراوە: (ما، ما، ما، مامە، مامە، ئەمە مەڕە زەردە، مەڕە زەردی من، من، دێمەوە مامە، وا دەڕۆم ئاوی دەدەم، دوای ئەوە دێمەوە).

لە دەرسی (١٨)دا وا هاتووە: (ئای مێوژ، مێوژی نەرمی نایاب. مام زۆراب، مەڕۆ وا دێم مێوژم ئەوێ. زوو وەرە، زوو، دەی وەرە، ئەمەیە مێوژی نایاب). لە چاپی دوای ئەودا وەهایە: (ئەمەیە مێوژ، مێوژی نایاب، مام زۆراب، مەڕۆ، مەڕۆ، مێوژم دەوێ، زوو وەرە زەینەب، زوو، دەی وەرە، ئەمەیە مێوژی نایاب).

دەرسی وایە: (زەینەب، مامە بەبەی بۆ ناردووی، وەرە بیبە، وەرە بیبە. مامە بەبەی بۆ ناردووم؟. وەی وەی، بژی بابە، بژی مامە، ئۆ، ئۆ، بژی بەبە). لە چاپی دواتردا وەهای لێ هاتووە: (زەینەب، وەرە، وەرە، مامە بەبەی بۆ ناردووی. مامە بەبەی بۆ ناردووم؟

بژی دایە، بژی بابە، بژی مامە).

ئەگەر درێژە بدەین بەو بەراوورد کردنە ئەبینین ئەو دەسکاریانەی کراون تەنها یا لە وشەدایە یا لە ڕستەدایە یا لە هەندێك لابردندایە لە هیچیاندا گۆڕان بەسەر دەرسەکە و چیرۆکی دەرسەکەدا نەهاتووە بەڵکو بەو مانا زیندووەی کە کاتی خۆی (باڵدار) دایناون وەك خۆیان ماونەتەوە. ئەمەش بەڵگەی دروستی ئەو شارەزایی و لێزانییەیە کە نووسەری (ئەلف و بێ) کاری لەسەر کردووە. چونکە وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد کە ئەو هەروا سەرپێیی و هەوانتە نەهاتووەتە ناو ئەو دنیا گەورەیەوە بەڵکو بە بەرنامەی ڕوون و ئاشکرا دەستی داوەتێ و خۆی بۆ ئامادە کردووە و (باڵدار) ئاگای لەوە بووە جیهانی منداڵان چەند سادە و ساکارە ئەوەندەش جیهانێکی ئاڵۆز و گرانە و توانا و شارەزایی تایبەتی ئەوێ. ئەگەر ئەو بیرو بۆچوونەوە نەهاتایە نەی ئەتوانی بەو زمانە سادەیەی منداڵ بابەت و ڕووداوەکان باس بکات، ئەو بە بست لە دنیای خەیاڵی منداڵ دوور نەکەوتووەتەوە، هەمیشە لە هەست و سۆزی منداڵ نزیك بووەتەوە ئەمانە بەشێکن لە سیفاتی بەهرەمەندی (باڵدار)و نەك ئەتوانن نیو سەدە بڕی ناو ڕۆژگار بکەن بەڵکو ئەگەر دەستی ناهەق لێ گەڕایە بۆ چەند سەدەیەکیش بڕی ئەکرد.

(باڵدار) ئەگەر ڕۆژێکیش لەسەر شانۆی پەروەردە و فێرکردن نەهێڵن کاری خۆی بکاتەوە بەڵام نەمری خۆی ئەپارێزێت و هەرگیز دڵی دوژمنی پێ خۆش نابێت، دەریش کەوت ئەوانەی چاویان بە (باڵدار) و ڕەنجی (باڵدار)دا هەڵ نەهات و ئاواتی نەمانیان بۆ ئەخواست تەنها خەڵکانی بێگانە پەرست و ئاڵقە لە گوێ و کۆنە (بەعسی) و گەجەر و گوجەری کورد بوون، ئەوانە ڕۆژێك ڕۆژگار پشتیان تێ ئەکات و خۆیان ئەبڕێنەوە! (باڵدار)یش هەمیشە زیندووە و هەرگیز بەدەستی ناحەز گەرداوی نابێت!

# هەندێ بابەتی ڕۆژنامەگەری لەگەڵ یارانی (باڵدار)دا

ئامادەکردنی: مەریوان سەلاح حیلمی

<u>مامۆستا ئەمین سەیان وتی:</u>

(باڵدار) ئەو پەپوولە دڵ ناسکە بوو، بەرەو گەنجینەی فەرهەنگۆکی کوردی باڵی ئەگرێتەوە بۆئەوەی لەهەگبەی (هەنبانە بۆرینە)ی کوردەواری وشەو بابەتی هەڵەچن کۆبکاتەوە لەپاڵ ئەوبەهرە یەزدانیەیە بەهێزەدا پاکنووسیان بکات و قەواڵەی بەختی پاشەڕۆژی ملیۆنەها خوێندکاری کوردی پێ بکاتەوە. (وەفاو دڵسۆزی) دوو بنەمای سەرەکی بواری پەروەردەو خوێندن کە لە (باڵدار)ی بلیمەتدا کۆبوبونەوە بۆیە ڕاستەوخۆ کاریان کردە سەر گۆڕانکاریەکانی بەرەوپێشچوونی پرۆسەی خوێندن، کوردانە ڕووبەڕووی ئەو پێشهات و بۆچوونانە بووەوە کە پێچەوانەی پێشەنگی خزمەت گوزاری و ڕابەری نەتەوەکەمانن، بۆیە تا خۆی مابوو نەیان توانی تۆزقاڵێك لەبایەخی کتێبەکەی کەم بکەنەوە. دوای مردنیشی گۆڕەپانەکە والایە هەریەکە لەئاشێ لێ ئەکات و هەریەکە لەپەنای سێبەری قوتی زەمانێکدا بە ئارەزوو خواستی خۆی بێ گوێدانە پارێزگاری سامانی نەتەوەیی و زانستی و بنەماکانی پەروەردەیی هاوچەرخ فتوای خۆی ئەدات، ئەوانیش ئەیانەوێت بە پێشەکیەکی سادە ڕۆحی (باڵدار)ی مامۆستا شاد بکەن ئەوە خۆیان ئەخەڵەتێنن. ئەوە هەر لە پیشەی لاری ئێمە ئەوەشێتەوە نەمەك نامان گرێت و بەزوویی پێشەواو زاناو قارەمانانی نەتەوەکەمان بیر ئەچێتەوە. ئەبێ (ئەلف و بێ)ی (باڵدار) چی لە (خەلدونیە)ی (ساطع حصری) کەمتر بێت کەملیۆنەها عەرەب شانازی پێوە ئەکەن. ئەو (ئەلف و بێ) شیعر ئامێزەی (باڵدار) کە ڕەچاوی هەموو بنەما ڕەسەنەکانی پەروەردەیی تیاکراوە. لەڕووی ڕواڵەت و ناوەڕۆکەوە هاوتان، لەڕووی ڕیزکردنی پیتەکانەوە لەئاسانەوە بۆ گران لەسەربەخۆوە بۆ لکاو لە دیارەوە بۆ نادیار، پێشخستنی ئەو پیتانەی لەسەرەتاو ناوەڕاست و کۆتاییدا وەك یەك ئەنووسرێن، تێکەڵ کردنی هەموو ڕێبازەکانی وانەوتنەوە و گرنگی دان بە ڕێگای دەنگ، بەستنەوەی بابەتەکە بەژیانی ڕۆژانەی منداڵ و دەوروبەری، دارشتنی بابەتەکان لە ڕادەی تێگەیشتنی منداڵداو ناسینەوەی ئەندامانی خێزان و پەیوەندیان بەیەکترەوە و ئاشکراکردنی پێداویستیەکانی ناومال، چەسپاندنی گیانی بەزەییهاتنەوە بە گیانداراندا بە تایبەتی گیاندارە ماڵیەکان، شارەزابوونی یاریە خۆماڵیە فۆلکلۆریەکان، ڕوواندنی هەست و سۆزو خۆشەویستی و وەفاو دڵسۆزی لەدەروونی قوتابیاندا و دوورکەوتنەوە لە کارەدزێوەکان و ناسینەوەی ڕەنگەکان، یەك خستن و نزیك کردنەوەی دەنگ و شێوەی پیتەکان بۆ ئاسان کاری کردەی فێرکردن. ئەم بەرهەمە مەزنە ئەم ڕۆمانە سەرنج ڕاکێشە کە لە (دار و دارا) وە بۆ (غاردان) درێژ ئەبێتەوە ماوەی هەشت مانگ ئەبێتە میوانی خانەوادەی قوتابی و هەر ڕۆژە کورتە چیرۆکێکی پەروەردەیی لێ ئەخوێنرێت. ئەم ( ئەلف و بێ) بەسوودە کەم ماڵ هەیە بە درێژایی نیو سەدە میوانداری لێنەکردبێت و لە ئامێزی نەگرتبێ. ئەم ئەرکە گەورەیە و ئەم پەیامە پیرۆزە کە (باڵدار) هۆکاری هەڵگرتنی بوو بەئەمانەتەوە گەیاندیە نەتەوەکەی بۆیە لەپێناوی پاراستنی سیمای نەتەوەیی و ڕێکخستنی کردەی فێرکردن و بەرژەوەندی پاشەڕۆژێکی پرشنگدار و شیاو بۆ کۆرپەکانمان، بابگەڕێینەوە بۆ ڕووناکیەکەی (باڵدار) کە تەنها قوژبنێك لەم کوردستانەدا نەما ڕۆشنی نەکاتەوە. ئەوانەی دوێنێ بەرنامەی (باڵدار)یان وەلاناو ئەوانەی ئەمڕۆش هەوڵی پینەپەڕۆی بەرهەمەکەی (باڵدار)

ئەدەن بابە خۆیاندا بچنەوە بەری ڕۆژ بە بێژنگ ناگیرێت. دەستوەرنەدەنە سامانی نەتەوەیی و خۆتان قەرزاری مێژوو نەکەن، ئەوەندە بە شێواندن و لەبەین بردنی شاکارەکەی (باڵدار)ەوە خۆیان خەریک نەکەن، باچاکسازییەك بهێننە کایەوە کە بۆ کورد سوودمەند بێت، با لەپێناوی بەرژەوەندی تایبەتی دا قەواڵەی بەختی نەتەوەکەمان بە فیرۆ نەدەین، با پەروەردەناسەکانمان بە وەزارەتەکانیشەوە وەك (پارتی و یەکێتی) بەرنامەکان پەرت نەکەن، گرفتەکە ئالێرەوە سەرچاوەی گرتووە، ئیتر گەڕی بارەترێ بە (باڵدار)ی نەمر مەکەن بەناوی چەند خاڵێکی لاواز کە خۆیان لێرەدا ئەیبیننەوە:

یەك/ (ئەلف و بێ)ی (باڵدار) کۆن بووە. بەداخەوە ئەڵێم نە (ئەلف و بێ)ی (باڵدار)و نەپەندەکانی پیرەمێردو نەمەقامەکانی عەلی مەردان و نەحەیرانەکانی سێوەو نەشیوەنەکانی گۆران کۆن نابن چونکە بەشێکی زیندووی سامانی نەتەوەیی کوردن.

دوو/ گوایە بەرهەمەکە زۆرەو تەواو ناکرێت. کاتێ مامۆستایان بە درێژایی نیو سەدە ئەو بەرنامەیەیان بەسەرکەوتوویی تەواو ئەکرد هیچ ئامێرێکی فێرکردن و وریاکەرەوە لە ئارادا نەبوو هەتا باخچەی ساوایانیش زۆر بەکەمی هەبوو. دوو هەفتە هەر بەگرتنی قەڵەمەوە خەریك بووین ئێستا پێش هاتنە قوتابخانە زۆربەی ئامێرە پێشکەوتووەکان بەکاردێنن بۆناڵێن ئەودەمە ئێمە مامۆستا بووین ئێستا مامۆستا فەرمانبەرە! دەمج کردنی پیتەکانیش بۆ ئەم لاوازی و بێتواناییەی مامۆستا ئەگەڕێتەوە، ئەی بۆناڵێن سەرپەرشتیارەکان ئەو دەمە سەرپەرشتیاری پەروەردەیی بوون و ئێستاش سەرپەرشتیاری حزبین. جاران ئەوانەی لە بەرنامەو کتێبەوە نزیك بوون پرۆگرامیان دائەنا ئێستا (حزب) خۆش بێت ئەوەی لە بەڕێوبەرایەتی پەروەردەوە نزیکایەتی بکات بەرنامە دائەڕێژێت هەرچیش دابنێن مامۆستای فەرمانبەر ڕۆژ ئەژمێرێت و سەریەشە بۆخۆی دروست ناکات ئەمەیە هەڵدێر هەر هەموو بەدوای یەکدا بەرەو نشێو شۆڕ ئەبینەوە تادان بەڕاستییەکاندا نەنێین و لەبەردەم (باڵدار)ی منەوەردا سەر نەوی نەکەین هەرگیز لەم پاشاگەردانییە دەرناچین!

**مامۆستا محەمەد مەجید وتی:**

ژیان لە گۆڕاندایە، گۆڕان بەرەو باشتر، گۆڕان بەبەرنامەو خۆئامادەکردن و ڕەخساندنی کەش و هەوایەکی لەبار بۆ ئەو گۆڕانە. بەرنامەو کتێبەکانی قوتابخانەش بەشێکن لەو پرۆسەی گۆڕانە، بۆیە ئەبێ بەردەوام لەژێر چاودێرییەکی زانستیانەو ژیرانەو پەروەردەیەکی دروستدابن. هەر کاتێك پسپۆڕان و شارەزایانی ئەم بوارە هەستیان کرد کە ئەم بەرنامە یا ئەو کتێبە پێویستی بە دەسکاری و گۆڕان هەیە. ئەوا ئەو شارەزاو پسپۆڕانە دوای تاوتوێ کردن و توێژینەوەو لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و فرەلایەنەو زانستیانە بە بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی گونجاو ئەگەن و بەئامادەکردن و ڕەخساندنی کەش و هەوایەکی لەباریش ئەو گۆڕانکاریە ئەنجام ئەدرێت.

هیچ کتێبێکی قوتابخانە بە چاوی (کتێبە پیرۆزەکان) سەیر ناکرێ بەڵام لەهەمان کاتدا هیچ بەرنامەو کتێبێکی قوتابخانە، سەرکەوتوو نابێت ئەگەر دەستەیەکی شارەزاو پسپۆڕ لە بوارەکانی (سایکۆلۆژی، کۆمەڵناسی و زمانەوانی و ئەدەبی)دا بەپلانێکی ڕێکوپێك و لە کەش و هەوایەکی گونجاودا بەشداری تێدا نەکەن. بەڕای من ئەو کتێبەی کە خراوەتە جێی (ئەلف و بێ) یەکەی (باڵدار) لە کەش و هەوایەکی ئاسایی و لەباردا لەدایك نەبوو بۆیە بە داخەوە ئەڵێم کە (نەبەکامی) پێوە دیارە (هەرچەندە ئێرە شوێنی قسەو باسکردنی نییە). من باوەڕم وایە بەڕاستی ئەزانم کە (پیت) بە هەردوو شێوەکەیەوە لەیەك وانەدا بخوێنرێت و لەگەڵ بزوێنەکانی تریشدا بەرجەستە بکرێ ئەوا باشتر. هەر ئەو کەش و هەوا نائاسایی و نەگونجاوەی ئەو کتێبەی باسکرا تیایدا لەدایك بوو لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایەی بۆی درا نەبوو بە کتێبێکی سەرانسەری کوردوستان، کتێبی (ئەلف و بێ) یەکەی (باڵدار) ماوەیەکی دوورو درێژە لە قوتابخانەکاندا ئەخوێنرێت، ڕۆڵێکی زۆر نایابی بینیوە، بەیەکێك لە کتێبە هەرە سەرکەوتووەکانی قوتابخانە ئەژمێردرێت. ئەم کتێبە بۆ قوتابی پۆلی یەکەمی سەرەتایی دانراوە کە تەمەنی لە دەوروبەری شەش ساڵی دایە. منالّ لەم تەمەنەدا وشەو ڕستەو بابەت و زمانی تایبەتی خۆی هەیەو حەزو ئارەزوو، چێژی تایبەتی خۆی هەیە.

یەکێك لە نیشانە دیارو ئاشکراکانی سەرکەوتووی (باڵدار) و کتێبەکەی ئەوەیە کە وشەکان و ڕستەکان و بابەتەکان، وشەو ڕستەو بابەتی منالانەن، بەزمانی منالان ئەدوێ، لەحەزو چێژی منالانەوە ڕستەو بابەتەکانی هەڵقوڵاون بۆیە ئەبینی کەسایەتییەکانی وانەکانی کتێبەکە هەر هەموویان گونجاون لەگەڵ بابەتەکانی کتێبەکەدا لای قوتابیان ناسراون و قوتابی هۆگریانە و ئەبێ بەهاوڕێیان. وێنەی هەریەکێك لەو کەسایەتیانە نیشانی هەر قوتابییەکی پۆلی یەکەم بدەی یەکسەر ئەی ناسێ و ناوو قسەکانی لەیادە، هەر وەك چۆن ناوو قسەی هاوڕێکانی ناو پۆلەکەی لەیادە لەبەر ئەوە هەر دەسکاری‌و گۆڕان و لابردنێك بەسەر ئەم کتێبەدا بێت ئەبێ ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندییە نایابانە فەرامۆش نەکرێت لەگەڵ ئەو مەرجانەی کەلەسەرەتاوە باسم کردن!.

# بەراووردێك لە نێوان وێنەکانی (ئەلف و بێ)یەکەی (باڵدار)*

شێروان کەریم

ئەڵێن مێژوو دەسەڵاتدار و خاوەن هێز ئەینووسێتەوە ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە و ئێمەی کورد ڕۆژانە بە چاوی خۆمان ئەیبینین، تا ئێستا مێژووی ئێمە بە دەست وپلی لەو جۆرە نووسراوەتەوە بۆیە کاتێك بەسەر ڕووداوە مێژووییەکاندا ئەچینەوە بە ئاشکرا هەست ئەکەین زۆر شت بە چەوتی گەیەنراوەتە دەستی ئێمە و زۆر شتیش لێڵ و شێواو بووە.

یەکێك لەو شتانە باسکردن و قسەکردنە لەسەر چۆنیەتی لە دایك بوونی (ئەلف و بێ)یەکەی (باڵدار)ی نەمر، ئەبینین تا ئێستا بە دروستی باسی نەکراوە و زۆرتر قسە و باسەکانی خەڵکی کردوویانە هەر قسە بووە و کراوە.

ئێمە لێرەدا لایەنێك لە لایەنەکانی ئەو (ئەلف و بێ) بەنرخە باس ئەکەین، ئەویش باسکردنی دروست کردنی وێنەکانییەتی و ئاشکرا کردنی ئەو هونەرمەندە دەست ڕەنگینەیە کە بۆ یەکەمین جار وێنەکانی کردووە. ئێستا ئێمە ئەو (ئەلف و بێ نوێ)یەمان لەبەر دەستایە کە ساڵی ١٩٥٣ بۆ یەکەمین جار وینەکانی (ئەلف و بێ)یەکەی کێشاون و بەپێی بواری ئەم باسە هەندێك لەو وێنانە ئەخەینە ڕوو. زۆر هەن ئەڵێن وێنەکانی ناو ئەو (ئەلف و بێ)یە خاتوو (ترروودی میتلمان) کێشاونی بەڵام ئەو چاپەی لەبەر دەستی ئێمەدایە شایەتی لەسەر هونەرمەندێکی تر ئەدات کە بەر لە خاتوو (ترروودی میتلمان) ئەو کارە جوانە هونەرییەی ئەنجام داوە، ئەویش هونەرمەندی بلیمەت و نەمر (بەدیع باباجان)ە کە بەو بەهرە جوانەی شکی کردووە دەرس بە دەرس بە گوێرەی مانای چیرۆکی دەرسەکان وێنەکانی کێشاون و گیانی جوانی بەبەردا کردووە دواتر گوایە لە ساڵی ١٩٥٦دا خاتوو (ترروودی میتلمان) هاتووە دەسکاری وێنەکانی (بەدیع باباجان)ی کردووە لە زۆر بەیاندا زۆر بۆچوونی (باباجان)ی وەك خۆی هێشتۆتەوە بۆ نموونە وێنەکانی بەر لە دەست کردن بە دەرسی یەکەم لە لاپەڕە (یەك و دوو)دا وەك خۆی بەبێ دەسکاری دانراونەتەوە. دوای ئەوە دەرسی یەکەم کە لە چاپی ١٩٥٣دا بە یەك دەرس هاتووە و لە چاپی دواتردا کراوە بە سێ بەشەوە ئەبینین جیاوازی لە نێوان وێنەی شەخسی (دارا)دا بەم جۆرەیە لە چاپی (باباجان)دا (دارا) منداڵێکی بچووکە و وا دەرکەوێت تەمەنی بۆ پۆلی یەك دەست بدات بەڵام لەوەی (ترروودی میتلمان)دا تەمەنی (دارا) هەراشتر دیارە و منداڵێکی زیتەڵە و وریا دیارە. لەوی یەکەمدا (دارا) تۆپێکی بەدەستەوەیە وەك هێمایەك بۆ یاری لەوی دووەمدا (دارا) کۆلارەی بە دەستەوەیە ئەویش هێمایە بۆ یاری کردن، ئیتر وێنەی (دارا) و شتەکانی تر زۆر نە گۆڕاون.

لەدەرسی دووەمدا (باباجان) وێنەی (دارا) و تۆپەکەی بەو جۆر کردووە و خاتوو (ترروودی) یش هەر بەهەمان بۆچوونی ئەو کردوویەتی تەنها جیاوازییەکەیان لە بینینی کەسێتی (دارا) دایە و هیچی تر، دوای ئەو دەرسی (داو) لەهەردوو لادا جیاوازییەکی کەم هەیە ئەویش لە دیاری کردنی کەسێتی کچەکەدایە کە لای (باباجان) کچێکی دیاری کراو نییە بەڵام لای (ترروودی) کەسێتی (زارا)یە کە هەر لەوێوە کۆتایی کتێبەکە

* هەڵوێست ژ١٠- ٢٠٠٤/٧/١٢



لای قوتابی بە کەسێکە ناسراو و دیاری ناو دەرسەکان دەستنیشان کراوە، بێگومان بۆچوونی (تروودی) بەجیٚ ترە. لە دەرسی چواردا جیاوازییەکە لە جۆری یاریەکە و بوونی کەسایەتییەکاندایە کە لای (باباجان) زۆرتر (دارا) کەسێتییەکی دیارە و ئەوانی تر ناسراو نین بەلاَم لەوی (تروودی)دا (زارا) ناسراوە و (ئازاد)و (نازیٚ)ش ئیتر وەك دوو کەسایەتی دەرئەکەون، جگە لەوەی تەرحی یاریەکەی (تروودی) گونجاو ترە.

لە دەرسی پێنجدا کەسێتی (دارا)ی لیٚ دەرکەیت کە منالیٚکی بچووکی تەمەن وردە لای (باباجان)و بۆ کەسێتی (دارا) ناگونجیٚ، سەرجەم ژمارە (٢)و دوو مەلەکە و دوو دارەکەی ئەو بەجیٚیە تا هی خاتوو (تروودی) کە زۆرتر (باباجان)ە و هیچ داهێنانێکی تیا نییە. لە دەرسی شەشدا ئەوی خاتوو (تروودی) لە هەموو ڕوویەکەوە گونجاو ترە. لە دەرسی حەوتدا هەرچەند ئەوی (تروودی) دووبارەکردنەوەی بۆ چوونەکەی (باباجان)ە بەلاَم تەرح کردنی وێنەی (دادە) بە جلی کوردییەوە گونجاوترە و شوێنی خۆیەتی و پڕ بە پێستی باسکردنی دۆ و مەشکەیە، ئەو وێنەی (دادە) مۆدەیەی (باباجان) خۆی لە خۆیدا شتێکی نابەجیٚیە. لە دەرسی (ڕاو)دا هەرچەندە بۆ چوونەکەی بە زۆری هی (باباجان)ە بەلاَم تەرح کردنی خاتوو (تروودی) زۆر بەجیٚیە.

لە دەرسی (دۆ ڕژاوە)دا هەمان بۆ چوونی (باباجان)ە بە کەمێك دەسکارییەوە، هەروەها دەرسی (زریزە)ش بەو جۆرەیە. بەلاَم دەرسی (داری درێژ) هی خاتوو (تروودی) بەجیٚ

تره. هەروەها دەرسی (ئاودان، نازێ، دار دەڕوێنم، مەڕە زەرد، مێوژی نایاب، بەبەی زەینەب، تەیارە، وس بە، سێو، ڕۆژباش، شووشە شیر، شەڕە مریشك، كەوی من، یاری تۆپ، پشە سپی... هتد) هەموویان دووبارەكردنەوەی بۆ چوونەكانی (باباجان)ن و خاتوو (ترروودی) دەسكاری كردوون و شتی لێ لابردوون. دوای ئەوەی باسكران ئەگەر سەیری ژمارەی لاپەڕەكانی هەردوو چاپەكە بكەین ئەبینین دەرسی یەكەم لە چاپی ١٩٥٣دا لە لاپەڕە (٣)وە دەست پێ ئەكات و دوا دەرسیشی كە (غارغارێن)ە لە لاپەڕەی (٦١)دا كۆتایی دێت بەو جۆرە تەواوی دەرسەكان (٥٩) لاپەڕەن. بەڵام چاپی (١٩٩٨) لە لاپەڕەی (٧)وە دەست پێ ئەكات و دوا دەرسیش كە (غارغارێن)ە لە لاپەڕەی (٦٤)دا تەواو ئەبێ بەو جۆرە هەموو دەرسەكان (٥٨) لاپەڕەن ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە دەرسەكان هەر لە ڕۆژی لەدایك بوونیانەوە تا مردنی (باڵدار) لە ١٩٩٨دا بەبێ گۆڕان ماونەتەوە. هەر لێرەوە ئەمەوێ ئاماژە بەو فەرهەنگۆكە بكەم كە (بەدیع باباجان) بۆ سەرجەم دەرسەكانی كردوون كە لە هەردوو چاپەكەدا بەبێ دەسكاری ماونەتەوە ئەو فەرهەنگۆكەش فەرهەنگۆكی هەم وشەو هەم پیت و هەم وێنەیە ئەویش بە مەبەستی لە بێژنگدانی ماندووبوونی چەند مانگ خەریك بوونی قوتابیێە كە لەو دەمانەدا دیوویەتی، ئەوەش بیركردنەوەیەكی زیرەكانەی (باڵدار)ە كە قوتابی بە لەبەركردنی ئەو فەرهەنگۆكە تێگەیشتنی خۆی ئەپارێزێت و هەست ئەكات ماندووبوونێكی بە هەوانتە لە دەست نەداوە. پێویستە ئاماژەش بەوە بكەین ئەوەی ناوی گۆڕان و جیاوازییە لە نێوان ئەو دوو چاپەدا ئەوەیە دەرسەكان لە چاپەكانی دوای چاپی ١٩٥٣ ناویان بۆ دانراوە و زووتر ئەوە نەبووە هەروەها لە چاپی ١٩٥٣ دا (٣) دەرس وەك شتێكی دووبارەو لاوەكی كەوتبوونە نێوان دەرسەكانەوە بەڵام دواتر هەر ئەو دەرسانە بە ناوەكانی (كۆلارە، سەردان، تڕێ) هێنراونەتە ناو ئەو كۆمەڵە دەرسەی لەدوای تەواوبوونی دەرسی پیتەكانەوە دانراون بۆ ڕاهاتن و پەراوە پێ كردن لەتەواوی ئەو دەرسانەدا گۆڕانكارییەكی وەها ڕووی نەداوە كە جیاوازی بخاتە نێوان ئەو دوو جۆرە چاپەوە. ئەمانە هەموو بەڵگەی ئەوەن (باڵدار) بناغەو تێگەیشتنێكی تەواوی هەبوە سەبارەت بە دانانی (ئەلف وبێ) و پێویستی لەدایك بوونی (ئەلف و بێ) هەر ئەوەش وای كردووە بەرهەمێكی زیندوو بە نەوەكانی خۆی بدات.

لێرەدا هەوڵ ئەدەین پەنجە دابنێین لە سەر جیاوازییەكان (بەدیع باباجان) وەك هونەرمەندێكی بەهرەمەندی كورد و خاتو (ترروودی میتلمان) وەك هونەرمەندێكی بەهرەمەندی ئەورووپی لە تەرحكردن و جوان كردنی وێنەكانی (ئەلف و بێ) یەكەی باڵدار لەپێناوی خزمەت بە منداڵی كورد كردن كە ئەتوانین بڵێین:

یەك/هونەرمەندی نەمر (بەدیع باباجان) بەبێ هیچ پێشەكی و بەبێ هیچ چاولێكردنێك بەدەست و پەنجەی ڕەنگینی خۆی سەلماندویەتی كە بەهرەو توانای دەربڕین و تێگەیشتن لە هونەر بەردی بناغەی هەموو كارێكی داهێنەرانەن نەك بوونی ناوچەیی یا ئاستی پێشكەوتنی شارستانی بۆ نموونە (باباجان) خەڵكی ناوچەیەكی ئاسیایە بەناوی كوردستان و لە ناو كۆمەڵگایەكی دواكەوتوودا ژیاوە كە ئاستی شارستانی ئەم لەگەڵ شارستانیەتی خاتوو (ترروودی) دا جیاوازییەكی بەرین و لە ڕادە بەدەر لە یەكتری جیایان ئەكاتەوە، كەچی توانای دەربڕین و بەهرەو تێگەیشتنی (باباجان) هیچ جیاوازییەكی نییە لە توانای دەربڕین و بەهرەو تێگەیشتنی كەسێكی وەك (ترروودی) و بگرە ئاستی دەست ڕەنگینی (بەدیع باباجان) بەجۆرێكە خاتوو (ترروودی) خستۆتە ژێر كاریگەری خۆیەوە و ئەوی ناچار كردووە شوێن پێی (باباجان) هەڵبگرێ.

دوو/تەرحی كەسێتییەكی نەگۆڕ لەسەرەتاوە تا كۆتایی وەك (دارا و ئازاد) لە (بەدیع باباجان) ەوە سەرچاوەی گرتووە بەڵام دواتر ئەوە بووە بە ئەزموونێكی هونەری بۆ خاتوو (ترروودی) كە زۆرتر وردبین بێت لەو دەستنیشان كردنەداوەك ئەوە كەسێتی (دارا) بە تەمەنتر بێت بۆ ئەوەی منداڵان چاوی لێبكەن لاسایی كردەوەكانی بكەنەوە چونكە هەمیشە بچووك لاسایی لە خۆی گەورەتر ئەكاتەوە هەر ئەمەش وای لە خاتوو (ترروودی) كردووە كە لە دابین كردنی چۆنیەتی كەسێتی هەریەك لە (زارا، ئازاد، نازێ، نەوزاد ... هتد) هەر لە سەرەتاوە تا كۆتایی لە ئاستی بیرو تەمەنی (دارا) دابن بۆ ئەوەی هەم ناسینەوەیان ئاسان بێت و هەم بۆ قوتابی جێی پرسیار نەبن، گرنگ ئەوەیە سەرجەم نەخشەكانی

(بەدیع باباجان) مایەی چاکسازی وێنەکانی خاتوو (ترروودی) ن ڕەنگە بەبێ ئەو دارشتنی بناغە هونەرییە لەلایەن (بەدیع باباجان) ەوە هەرگیز خاتوو (ترروودی) ئەنجامدانی کارێکی هونەری وەهای لەدەست نەهاتایە وەك بەچاوی خۆمان ئەیان بینین، ئەگەر سەرچاوە نەبێ ڕووبار و جۆگە لە کوێوە دەست پێ ئەکەن؟!. لە ڕاستیدا وایە ئەگەر بەهرەمەندێکی دەست ڕەنگینی وەك (بەدیع باباجان) نەبوایە و پێشتر وێنەکانی ئەو بۆچوونانە دەرنەبڕیایە شتێکی ئاشکرایە کە کەسێکی وەك خاتوو (ترروودی) ڕەنگە بەو جۆرە وێنەکانی بە بیرو خەیاڵدا نەهاتایە چونکە کەش و هەوای دەرسەکان بەگشتی بەبیری ووردی (باباجان) ئامادەکراون و ئەوی خاتوو (ترروودی) کۆپییەکی دەسکاری کراوی ئەوانن، ئەوەش بەڵگەیەکی بەرچاوی توانای هونەری ئەو هونەرمەندە کوردەیە کە خەڵکی لە بوونی بێئاگان و نازانن چۆن بناغەی (ئەلف و بێ) یەکە ئەقڵییەتی کوردی لە پشتە هەروەها وێنەکانیش تواناو بیرکردنەوەی کوردی لە پشتە. ئەم سەربازە گومناوانەی کورد لای گەلی خۆیان هەمیشە هەقی تەواوی خۆیان پێ نەدراوە. هەر کەسێکی تێگەیشتوو بەو (ئەلف و بێ) بەهادارەی (باڵدار) دا گوزەر بکات هەست بەوە ئەکات دانانی (ئەلف و بێ) یەکە چەند گرنگ و نایاب و بێ هاوتایە هەربەو جۆرەش وێنەکانی تایبەت و هونەرمەندانەیە و ئەقڵییەتێکی ڕەسەنی کوردی لە پشتەوەیە لە واقیعی بیری وشەو ڕستەکانەوە هەڵقوڵاوە و ڕێك ئاستی کۆمەڵایەتی کورد دەستنیشان ئەکات کە ئەیەوێت لەگەڵ شارستانییەتی ڕۆژگارێکی تازەدا خۆی بگونجێنێ، ئەوە ڕاستییەك بوو تا ئێستا لەناو بێتوانایی خەڵکانی هیچ لە بار نەهاتوودا پەردەپۆش کرابوو، کرابوو بەژێر لێوی لەبیر چونەوەوە. گەلی ئێمە لەگەڵ ئەوەی گەلێکی ژێر دەستەو داگیرکراوە و هیچ مافێکی ژیانی پێ ڕەوا نەبینراوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆڵەی هەڵکەوتووی وەهای لێ کەوتۆتەوە کە مرۆڤ سەرسام ئەکات ئەوە (گۆران) لە شیعردا، ئەوە (باڵدار) لە دانانی (ئەلف و بێ) دا، ئەوە (بەدیع باباجان) لە وێنەکێشاندا، کە هەر یەکەیان لوتکەیەکی تایبەتن و لە واقیعی ژیانی کۆمەڵگای کوردەوە سەریان هەڵداوە لە پێناوی خزمەت بەو کۆمەڵگەیەش ژیاون!.



# (باڵدار)
# گەورە دەروونزانێکی پەروەردەیی بوو!

م/ئاوات ئەبو بەکر

کاتێك سەرنج و بۆچوونەکان ئەخەینە کار، بە بیرو هۆش و چـاکە و خۆشەویـستیـیەوە چـەندین دڵـسۆز لـە ئاسـۆی مرۆڤەکاندا بەدی ئەکەین بەتایبەتی ئەوانەی کە بە (پاکی و بە چاکی) و بە (خۆشەویستی ڕاستەوە) بۆ وڵات و نەتەوەکەیان ژیانیان گوزەراندوە. زۆر شاعیرو زاناو دانا لەناو ئەم وڵات و گەلـەدا توانـای بێ سنووری خۆیان بۆ خزمـەتی بێ کۆتـایی بەسـەر بـردوەو جێگـە دەسـتیان دیـارە یـەك لـەو سـەردارە بەئەمەکانـە (ئیبراهیم ئـەمین باڵـدار) ی هەمیـشە زینـدووە کـە مامۆسـتایەکی بەهرەمەنـدو دەروونناسـێکی پـەروەردەی لێهاتووە بوو، شەش ساڵ لەمەو بەر و لە ڕۆژی ١٩٩٨/٧/١٢ ئێمەی بەجێ هێشتوو لە گردی سەیوان نێژرا، ئەم مامۆستا نەمرە تا لەژیانیـدا بـوو تـوانی بە هاوکاری خامە بەبڕشت و ڕەنگینەکەی لەبەر چرای شەوگارو لەناو باخ و لەژێر سێبەری دارە جوانـەکانی ڕۆژگـاری ئـەم کوردسـتانە بـێ نـازەدا تـوانی چەندەها وشەی ناسك و ناخ هەژێن و پـەروەردەیی بخاتە سەر لاپەڕەی سپی و مێشکی نەوەکانی ئەم گەلە ستەم دیدەیە، کە هـەموومانی کـردە قـەرزاری خـۆی و تـا ئێـستا ئێمـەش نـەمان توانیـوە پاداشـتی تـەنها یـەك شـەو لـە شـەوگارە بێـدارەکانی بدەینەوە.

بە دڵنیایی‌یـەوە ئـەڵێم ئـەوەی بـۆ منـداڵ و بـۆ خوێنـدن و بڕوانامەی بەچاکی و بەپاکی کاری نەکردبێت نازانێ چێژی ئەو شاکارە لە چیدایەو چەند مەزنە، ئەو شاکارە ڕاستە (ئەلف و بـێ)ی لێ نووسـراوە بـەلام چـیرۆکە، شـیعرە، ڕۆمانـە، **قوتابخانەیەکی پڕ وەفاو خۆشەویستیە بۆ هەموو شارێکی ئەم** کوردستانە. چەند لەبارەی ئەو شاکارەی ئەو مرۆڤە مەزنەوە بدوێین هێشتا لەچاو گەورەیی خۆیدا دڵۆپ بە دەریایە:

یەك/باڵدار لە ژینگەی قوتابیانی پۆلی یەکەمدا ژیاوەو قاڵ بـووە و ئـاڵودەی ئەندێـشەکانی بـووەو زۆر لـە نزیکـەوە بـە بـەردەوامی نـاخی منـداڵی ناسـیووە، زانیویـەتی چ وشـەیەکی جـوان و بەکـەڵك سـاڕێژی بـاری دەرونـی و کۆمەڵایـەتی پەروەردەیی و ئەوان ئەکات و گەشەی پێ ئەکات. دڵنیا بووە و زانیوویـەتی منـداڵ لـەو تەمەنـەدا چۆن بیر ئەکاتـەوە و چـۆن ئـەدوێ و چـی بـەلاوە خـۆش و چێـژدارە. ئـەو کەسـەی لـەم مەیدانەدا نەتوابێتەوە ناتوانێ هیچ بکات و گەر شتێکیشی کرد شتێکی کـاڵ و نەبەکام ئـەکات و پاشـان بـەرەو ڕووی تانـەو تەشەری خەڵك و مێژوو ئەبێتەوە.

دوو/لـەم شاکارەی (باڵـدار) ی نەمردا لە دیـارەوە چـووە بـۆ نادیاری، لەتەنها ووشەوە چووە بۆ دەستەواژەو پاشان بابـەتی بـەپێزو دەوڵەمەنـد لەهـەموو بوارێکـدا منـداڵ چێژو تـامی تـا گەورەبوون لە بنی دانیدا ئەمێنێتـەوە. لە تـەواوی دەرسەکانیدا (دوازدە) وشـەی کـردارەو ئەوانـەی تـریش لـە (سـەر باسـەکان) بەرجەستەیەو چل وپێنج بابەت ئەکات و هەموو پەنجاو حەوت بابەتە.

سێ/لەبـەرگی پەرتوکەکـە تـا دوا لاپـەڕەی پـڕە لـە جووڵـەو یـاری و پێکـەنین و خۆشەویـستی بـۆ کەسـانی دەوروبـەری و ئامۆژگاری کە لەوێنـە و بابەتـدا ڕەنگی داوەتـەوە. (کە ئەمـەش **کرۆکی ناخی منداڵەو گەشەی پێدەکات).**

**چوار/لەگەڵ هەڵدانەوەی بەرگەکەیـدا ئامـادەکردنی گشتی و تایبـەتی دەرئەکەوێ بەساکاری و ناڕاستـەوخۆ ئـەڵێت: بابـەتی**

بەرجەستەی واقعی ئەبێتە وێنە، پاشان لە داهاتوودا ئەبێتە ئێسکی پیت و وشە کەلە هزری منداڵدا ئەگۆڕێت و فێری خوێندنەوەو نووسین و تێگەیشتنی ئەبێ.

پێنج/ تەنها پەرتووك بووە لەو ساڵ و ساتانەدا کە بە ڕەنگینی دەرچووە.

شەش/لەسەرەتاوە پیتە (بزوێنەکان) فێری قوتابیان ئەکات لە دوای وشەی (دار) ..ی،و،ە،وو،ۆ،ێ). پاشان ئەو پیتانەی یەك شێوە نووسینیان هەیەو ئاسانیشن لە نووسیندا چونکە جوڵەی کەمە بۆ ماسوولکەو پەنجە بچووکەکانی قووتابیان بەدوای یەکدا دێن وەك (ر، ز، و، ۆ، ڕ، ژ).

حەوت/لەگەڵ زیاد بوونی توانای قوتابیان لە (بینین و بیستن و نووسین)داو شارەزابوون لە ژینگەی نوێ، بابەتەکانیش ڕوو لە زیادی و فراوانی ئەکەن و لە ژینگەیان دوور ناکەوێتەوە.

هەشت/هەموو بابەتەکانی لایەنی (پەروەردەیی، زانستی، ئەدەبی، ڕۆشنبیریی، کۆمەڵایەتی) تیادا بەدی ئەکرێت.

نۆ/خۆشەویستی دارو درەخت و گوڵ و پارێزگاری لێکردنیان نا ڕاستەوخۆ لە لای قوتابی و (ژینگەی پاك)ی کردووەتە دروشمی تەندروستی چاك وەك بابەتی (دار، داری درێژ، ئاودان، نازێ،... هتد).

دە/زۆربەی بابەتەکانی لەو (کەرەسانە) ئەدوێن کە لەو (وەرزە)دا دەرئەکەون و یا دێتە بەرو لای منداڵ خۆشەویست ئەبن وەك (باران دەبارێت، کۆترو پەشۆڵە، ئاو، جووجەکان، بەرخ، سێو،... هتد).

یازدە/نەهاتنی هەندێك پیت بە دوای یەکدا کە شێوەی نووسینیان لە یەك ئەچێت وەك (ت، س، ك،... هتد).

دوازدە/نەهاتنی هەندێ پیت بە دوای یەکدا کە دەنگیان لە یەکەوە نزیکە یا سازگەو ئاوازیان لە یەك ناوچەدایە وەك (ز، س، ژ، ش، ت، پ، خ، غ... هتد).

سیازدە/لەبەر ئەوەی قوتابیان ماوەیەك تەمەنیان لەگەڵ ئەم شاکارە ئەم دیوو ئەو دیو پێ ئەکەن و ئەیخوێننەوە شارەزاییان گەشە دەکات ئەبینی پیتەکانیش تا بەرەو کۆتایی دێت ئاڵۆز ئەبن و بابەتەکانیش ژمارە ڕیزەکانیان زیاد ئەکات (گ، ه، خ، غ،... هتد).

چواردە/بەشێوەیەکی جوان لە ناخی قوتابیان نزیك ئەبێتەوەو ئەیان خاتە دنیای خەیاڵاتەوە وەك (نیسك بۆ مریشك)و (جۆ بۆ جوجك) کە خۆی لەخۆیدا ئەم شێوازە لە زوربەی زنجیرە (کارتۆنیەکان)دا بەرچاو ئەکەون، زۆر چێژی هەیەو ئاسایشە بۆ منداڵ.

پازدە/سادەیی لە کەرەسەی فێرکردندا (الوسائل التعليمية) کە قوتابیان ئەتوانن ئامادەی بکەن و جوان لەبیریاندا بچەسپێ و لە ژیانیشدا بەکاری ئەهێنن وەك (ئاو، مێوژ، بەبە، سێو، گوڵ... هتد).

شازدە/لە لاپەرەی (٦٥)دا (فەرهەنگی وشە) لە کۆتایی پیتەکاندا زۆر بە جوانی و بە شێوەیەکی هونەری داڕێژراون کە ئەکاتە (پیت و وشەو وێنە) لەیەك لاکێشەدا بەلای قوتابیەوە سەرنج ڕاکێش و جێی متمانە بەخۆکردنەو شتێکی بابەتیە.

حەڤدە/بوونی چەند بابەتیکی کۆتایی کە مامۆستا زیاتر



ئامادە ئەکەن بەرەو پۆلی دووەم گەر بەشێوەیەکی ڕاست و دروست کارەکەی تەواو کردبێت.

هەژدە/چڕوپڕی وشەو ڕستەو بابەتی سادەو بە پێز بە هاوکاری مامۆستای کارامە وا لە قوتابیان ئەکات بە ئاسانی وشەو ڕستەکانی بەدەر لە پەرتووکە کە بخوێننەوەولێیان تێبگەن و فێریان بن.

لە کۆتایی دا ئەڵێم ئەمە شاکاری مرۆڤێکە بەر لە ڕۆژگاری عەولەمەیەو ئەشێ بە بۆچوونی هەندێك کەس کەم و کورتی تیا بێت بەڵام گەر وەهاش بێت ئەوانە دەگمەن و کەمن.

# هەندێك لە ڕوداوو بەسەرهاتەکانی پرۆفیسۆری خوالێخۆشبوو باڵدار...*

*کەرەتێك گێڕایەوە وتی: جارێکیان لە ئەمریکا لە چێشتخانەیەك نانم ئەخوارد دوای ئەوەی تەواو بووم و چوومە دەرەوە و دوورکەوتمەوە یەکێك لە دوامەوە بە دەنگی بەرز بانگم ئەکا پرۆفیسۆر پرۆفیسۆر، ئیتر تێگەیشتم کە لەگەڵ منیەتی ڕاوەستام و ئەویش وتی: وەرە جانتاکەت لێ بەجێماوە منیش گەڕامەوە پێم وت: تۆ چۆن ئەزانی پرۆفیسۆرم؟ ئەویش وتی: هەر پرۆفیسۆرە جانتاو عەینەك و شەپقەی لە بیر ئەچێت.

*هەر لە ئەمریکا لەگەڵ خوالێخۆشبوو مامۆستا تۆفیق دەوڵەتدا بە یەکەوە ئەیانخوێند مامۆستا تۆفیق وتی: جارێك هات بۆ لام و ماوەیەك لام بوو پاش خواحافیزی کردن ڕۆیشت لە پەنجەرەکەوە سەیرم کرد دیمەنێکی سەیر بوو!! چاکەتەکەی منی لەبەر کرد بوو، باڵای زۆر بەرز بوو منیش باڵا کورت قۆڵی چاکەتەکە بستێکی مابوو بگاتە دەستی و لە خواریشەوە گەیشتبووە نزیك قایشی پانتۆڵەکەی، ئیتر بە پێکەنینەوە بانگم کرد و پێم وت: ئەویش بە دەم پێکەنینەوە گەڕایەوە و چاکەتەکەی خۆی لەبەر کرد.

*جارێك لە سلێمانی چووم بۆ دوکانی کاك جەزای حاجی مەلا شەریف چەند کەسێك لەوێ دانیشتبوون و پێ ئەکەنین.. وتم ئەوە چی ڕووی داوە؟ وتیان: تۆزێ لەمەوپێش مامۆستا باڵدار هات بۆ ئێرە دانیشت سەیرمان کرد پێڵاوەکانی تاکێکی ڕەشەو تاکێکی قاوەیی، کە ئاگادارمان کردەوە خۆیشی زۆر پێکەنی و وتی: ئەوە تاکێکی هی جوامێری کوڕمەو ئەندازەی پێی هەردووکمان وەك یەکەو بۆیە ئەم هەڵەیەم کردووە.

*ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ ئاهەنگی دەرچووانی زانکۆی سلێمانی بوو، هەموو مامۆستاکان ڕۆبمان لەبەرکردبوو مامۆستا باڵدار ڕۆبەکەی گەیشتبوە ئەژنۆی و ئەوەی تەنیشتی ڕۆبەکەی لە زەوی ئەخشاو بە جووتە لای یەکەوە بوون، منیش پێم وت: ئەمە وەك چاکەت لەبەرکردنەکەی ئەمریکایە بەڵام ئەم جارەیان هەردووکتان وەك یەکن، ئیتر بە پێکەنینەوە ڕۆبەکانیان گۆڕیەوە.

*جارێك وا ڕێکەوت لە پشت پەنجەرەی ژوورەکەی مامۆستا باڵدارەوە (سیوجگەر فرۆشێ) ئیشی ئەکرد و هەمیشە ژوورەکەی مامۆستا پڕبوو لە مێش، بە خۆی و قوتابییەکان مێشیان دەرئەکرد کەچی فریا نەئەکەوتن، ئیتر وای لێ هات وزەی تیانەما دەستی دایە تەلەفۆنەکەی بە خەیاڵی ئەوەی لەگەڵ دائیرەی صحە قسە بکات بە هەڵە ژمارەی مدیری پۆلیس لێ ئەدات و ئەڵێ: من مامۆستا باڵدارم و فریام بکەون و مێش خواردمی!! ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێ: مامۆستا گیان قابیلە من کۆمەڵێ پۆلیس بنێرم بە کلاشنکۆفەوە مێش بکوژن؟!! ئیتر مامۆستا ئەزانێ کە بە هەڵە ئەو ژمارەیەی لێداوە ئەڵێ: ببورە من دائیرەی صحەم داوا کردووە.

*مامۆستا باڵدار وتی: تازە ژنم هێنابوو بەیەکەوە هاتین بۆ هاوینەهەواری سەلاحەدین، دەمەو عەسر بوو خەریك بوو لە ژوورەکە بێینە دەرەوە لە پڕێکدا لە دەرگایان دا کە سەیرم کرد شاگرد ئوتێلەکەیە، وتم: چیت ئەوێ؟ وتی: مامۆستا میوانت هاتووە لە خوارەوە لە سالۆنەکە چاوەڕێت ئەکات. وتم باشە، کە چوومە خوارەوە سەیرم کرد پیاوێکی پیر دانیشتبوو کەمنی دی یەکسەر هەڵساو بەپەلە هات بۆ لام و خۆی چەمانەوە و دەستی خستە ناو دەستمەوە. منیش نەمناسی وتم: تۆ کێیت؟ وتی: من قوتابی جەنابتم لە بیرت نایە لە قوتابخانەی سەرەتایی دەرست پێ ئەوتم؟

منیش: دەمم نزیك گوێی کردەوەو وتم: مردوت مرێ با کەس گوێی لێ نەبێ کەی کاتی ئەوەیە من تازە ژنم هێناوە و هاتووم بۆ (شهر العسل) حەیام مەبە.[1]

---

[1] -*تێبینی/ مامۆستا باڵدار هەر لەو کاتەوەی زانکۆی سلێمانی گوێزرابۆوە بۆ هەولێر ئەو لە زانکۆی (صلاح الدین) وانەی ئەوتەوە، پێش بڕیاری (٩٨٦) واتە کاتی گرانی و خراپی باری ئابووری خەڵك بە گشتی، ئەو کات ئەو لە هەولێر ئۆتۆمبیلێکی پێ ئەبێ لەجۆری (مارسیدس) ڕۆژێك ئۆتۆمبیلەکە لە کار ئەکەوێ و ئەیبات بۆ لای وەستا بۆ ئەوەی بۆی چاك بکاتەوە، وەستا پێی ئەڵێ: دوا نیوەڕۆ وەرەوە.
مامۆستا باڵداریش دوا نیوەڕۆ ئەچێتەوە بۆ ئۆتۆمبیلەکەی وەستاکە پێی ئەڵێ: ئەوە بۆم چاك کردویت و ئێستا بەتەواوی ئیش ئەکات، دوای ئەوەی مامۆستا ئۆتۆمبیلەکەی تاقی ئەکاتەوە بە کابرای وەستا ئەڵێ: ئەمە چەندی کرد؟ ئەویش لە وەڵامدا ئەڵێ (٥٠٠) دینار !
مامۆستا باڵدار ئەم وەڵامەی زۆر بەلاوە سەیر ئەبێ و بە وەستاکە ئەڵێ: (٥٠٠) دینار بۆچی؟ خۆتۆ ئەوەندەی ٢ سەعات ئەبێ ئیشی تیا ئەکەی. من (٤٠ساڵ) ە مامۆستام ئەگەر معاشەکەم بگاتە (٤٠٠دینار)!!
کابرای وەستاش لە وەڵامی ئەمەدا بە مامۆستا باڵدار ئەڵێ: جا مامۆستا کێ وتی: مستەقبەلی خۆت بفەوتێنە و ببە بە مامۆستا؟
مامۆستا باڵداریش ئەڵێ: وەڵڵا بابە حەقتە ئەوە (٥٠٠دینارەکە).

---

* شەوچەرەی شار

# ئەلف و بێی کوردی لە نێوان بەڵێ و نەخێردا

(ئەلف و بێی نوێی کوردی) ی برایم باڵدار یەکێك بوو لەو شاکارە بەنرخانەی کە دەیان جیل قەرزاری بابەتەکانی بوون. پاش تێپەڕبوونی نیو سەدە بەسەر ئەو شاکارەدا لێرەو لەوێ هەوڵدرا کە گۆڕانکاری تیابکرێت لە ئەنجامدا کتێبی (ئەلف بێ) لە نووسینی (عبدالله محەمەد ئەمین) لە سلێمانی پاش چەند چاپێکی ڕەش و سپی و دووچاپی ڕەنگاو ڕەنگ سەدان گۆڕانکاری و زیاد و کەم کردن جێگیر بوو، بەپێی بڕیاری وەزارەتی پەروەردەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە خوێندنگاکاندا بووبە جێگرەوەی کتێبەکەی باڵدار، جا لێرەدا ئەوەی ئێمە ئەمانەوێت بەسەری بکەینەوە ئەو دەنگە نەخێرانە بوون کە بەرامبەر کتێبەکەی باڵدار دروست بوون، (م. ڕێزان مەجید شەریف) کە خۆی خاوەنی پرۆژەیەکی ئەلف و بێی کوردی بوو (م. ئاوات ئەبوبەکر) بەهەمان شێوە کتێبێکی لەم بوارەدا هەبوو لەگەڵ (حسین بەفرین) کە بەهۆی ناڕەزایی بوونیەوە کتێبێکی بە ئەڵقە ئەڵقە نووسی.

م. ڕێزان مەجید شەریف کە مامۆستایەکی خانەنشینەو چەندین ساڵ خەریکی وتنەوەی وانەی ئەلف و بێ بووە، لە وەڵامی ئێمەدا وتی: من بۆ ئەوەی ئاسودەبم ئەو بابەتەم لە ڕووی خۆمدا داخستووە، چونکە هەر کەس دەسەڵاتی هەبوو ئیشی ئەڕواو ئەوانەی چواردەوریشی گوێ نادەن بە دەنگە نەخێرەکان، ئایا ئەبێ هەر کەسێ دەسەڵاتی هەبوو هەوڵی کپ کردنەوەی دەنگەکانی بەر لەخۆی بدات؟!

لە ئەمەریکا بۆ کتێبێکی پۆلی شەشەمی سەرەتایی (زانست) (٦٠٠) شارەزا ئیشی تیا ئەکەن ئەی بۆچی لای ئێمە کتێبێکی وەك (ئەلف و بێ) ئەوەندە بەبێ بەرپرسیاریەتی بڕیاری لەسەر بدرێت؟

*+تۆ کێی تر بەبەرپرس ئەزانی لەم مەسەلەدا؟*

–ئەدیب و نوسەرانیش بەرپرسن، چونکە ئەوان منیان بینیوەو لە لای خۆم شایەتی باشیو چاکی کتێبەکەیان داوم ئەی بۆ بێدەنگن! بێجگە لەوە لە هەولێرو سلێمانی هەستم کرد کتێبەکە ڕۆڵی هەیە. لە سوید چەند ئەلف و بێ یەك ئەخوێنرێ ئەی بۆچی لێرە یەك دانە ئەسەپێنرێ؟ باڕێ بە کەسانی تریش بدرێ تا لە دوایدا ئەزموون بکرێ کامەیان نیسبەتی سەرکەوتنی زیاترە ئەوە بڕیاری لەسەر بدرێ بۆ نموونە نەرمین خانی وەزیرم بینی لە ٢٠٠١/١٠/٦ دا وتی: ئیشەکەت جوانە تکا ئەکەم کوڵ نەدەیت منیش وتم: باشە خۆ دەسەڵات لە دەست ئێوەدایە وتی: تازە ئەوە قەراری لەسەر دراوە ئەگەر بیگۆڕین خەڵك سیقەی نامێنێ با ئەم ساڵ بڕوا ساڵێکی تر لەسەر ئەوەی تۆ لێکۆڵینەوە ئەکەین کەچی هەر نەیانپرسیەوە!

هەروەها لە هەولێریش هەوڵی زۆرمدا تا لە ٢٠٠١/١٠/٨ دا لیژنەیەکی مامۆستایانی هەولێر سازکرا لەسەر هەڵسەنگاندنی (ئەلف و بێ)ی من و بڕیاری خوێندنی درا کە پەسەندە بۆ ساڵی داهاتوو بخوێنرێ.

*+ئەی پاشان؟*

–ساڵی داهاتوو مەسەلەکەیان بە تەواوی ئیهمال کردو پشتگوێیان خست.

م. ئاوات ئەبوبەکر ئەحمەد: کە مامۆستایەکی (ئەلف و بێی کوردی)یەو چەند ساڵێکە ئەم وانە ئەڵێتەوەو خاوەنی پرۆژەیەکی (ئەلف و بێ) شەو زۆر ناڕازیەو ئەڵێ:

-٢٠٠١/٨/١١ پێشانگەی پرۆژەی ئەلف و بێ لە گەلەری کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان کرایەوە کە پێکهاتبوو لە هەموو پیتەکانی زمانی کوردی بە شێوەی سەردەم پاش ئەو پێشانگەیە پێم وابوو هەنگاوێك پرۆژەکەم ئەچێتە پێشەوە لە لایەن (پەروەردە)وە بەلاّم هیچ گرنگی پێ نەدرا.

بە هەمان شێوە لە هەولێر ٢٠٠١/١٠/٦ لە هۆڵی میدیا کردمەوە بەسەرپەرشتی بەڕێز (عبدالعزیز تەیب) وەزیری پەروەردە لە ئاکامدا داوای لیژنەیەکی لە مامۆستایانی کۆلێژی (سەلاح الدین)و پرۆگرامەکانی وەزارەتی پەروەردە کرد بە مەبەستی هەڵسەنگاندن بەلاّم بێ ئاکام بوو.

*+لە رێگەی ترەوە هەوڵت نەداوە؟*

-بەڵێ ٢٠٠٢/٦/٢ بە شێوەی رەنگاورەنگ نوسخەیەکم دا بەیەکێتی مامۆستایانی سلێمانی بەلاّم هیچیان بۆ نەکردم.

دواتر چوومە سەردانی (شێخ عەفان نەقشبەندی) سەرۆکی یەکێتی مامۆستایانی هەولێر ئەویش پرۆژەکەی بینی و زۆری پێیە جوان بوو بەلاّم هیچی بۆ نەکردم.

(حسین بەفرین)ی شاعیرو نووسەر لەوەلاّمی پرسیاری:

*+هۆکاری نەخێری مامۆستا حسین بەفرین لە بەردەم گۆڕانی (ئەلف و بێ)ی باڵداردا بۆ (ئەلف و بێ)ی م: عەبدوڵلاّ لەچیەوەیە؟*

-کتێبەکەی باڵدار لەبەرئەوەی بۆ پێویستیەکی کۆمەلاّیەتی و زمانی نەتەوەییو بلاّوبوونەوەی خوێندەواری هاتە لەدایك بوون، ئەو لەدایك بوونەی شێوەیەکی واقیعی و حەقیقی پێبوو بۆیە لەماوەی نیو سەدەدا هەزاران هەزار رۆڵەی ئەم گەلەی گۆش کرد.

ئەم کتێبە لەهەموو روویەکی ئەدەبیو زمانەوانیو دەروونناسیو کۆمەلاّیەتیو پەروەردەیی تەنانەت هونەرییەوە لەهەموو روویەکەوە پەسەند بوو هەر لەبەرئەوەش بەبەردەوامی رۆشنبیران و مامۆستایانی دڵسۆزو لێزان پەنجەی گۆڕانیان بۆ نەئەبرد، ئەگەرچی باری رۆشنبیری لە رابردوودا لەگەڵ ئێستا زۆر بالاّ ترو گەشاوەترو حەقیقی تر بوو، بە پێچەوانەوە ئێستا گەندەڵیو نارۆشنبیریو نەفامیو نەزانی لەهەموو روویەکەوە چ لەتەربیەدا چ لەئەدەبدا چ لەباری کۆمەلاّیەتیدا دەستێکی بالاّی هەیە.

ئەگەر ئالێرەوە باس لە گۆڕان بکەین ئەبێ ئەو گۆڕانە چی لەپشت بوو بێ کام ئەقڵ و ماریفەتی لەپشتە، ئێرە خالّی جیاکردنەوەی مانای ئەو گۆڕانەیە کەبەسەر ئەلف و بێ کەی باڵدارداهاتووەو ئەلف و بێ یەکی بێ مانا خراوەتە جێی، راستە ئەوە ئیشی من نەبوو بەلاّم هەموو ئەو کەم و کورپانەی کەلەباری ئەدەبیو فەرهەنگیو پەروەردەییو زمانەوانیو عەقڵیەوە بەدیم کرد بوونە هۆی جوڵانم بۆ دەست دانە ئەو کارە.

ئەو (نە ء)ەی من لەگەڵ ئەو (نا) ئانەی تردا جیاوازی زۆرە چونکە من نەشەڕی ئەلف و بێی نووسینم کردووەو نەئەلف و بێ نووسم و نە نیازم وایە کورسی ئەلف و بێ داگیر بکەم تەنها ئەو حەقیقەتانە هاندەرم بوون کە باسم کردن ئەو باسەی منیش نووسیومە دڵنیابە بوارێکی زۆر تەسکی ئەو رۆژنامە زۆر بچکۆلەیەم پێ درا، جگە لەوەی دەیان دێرو بۆچوون و باسکردنم سانسۆری لەسەر بووەو دەستی لەبین نراوە، بەدڵنیاییەوە ئەوەت پێ ئەڵێم: کە ئەو نوسینە تەواو ئەو حەزو ئارەزوو زانین و بۆچوونانەی من نەبووە کەویستوومە بیان نووسم، لەپاڵ ئەوەشدا ئەو نووسینە دوورو درێژە (ئەگەر درۆی تیانەبێ) تاکە بەرهەمە لە بواری پەروەردەو فێرکردندا لەدایك بووەو تا ئێستەش نەلەئەدەبی فارسی و نەعەرەبی (ئەوەندەی من، ئاگاداربم ) ئەو شێوە لێکۆڵینەوەیە نەبووە.

بەلاّم پاش دەرچوونی (کام ئەلف و بێ ویژدانتان رائەچڵەکێنێ)؟ من نوسخەیەکی (ئەلف و بێ)ی ئەو کابرایەم بەردەست کەوت بەچاپی رەش و سپی بۆ یەکەمجار کە بۆ تاقیکردنەوەی ئەو قوتابخانە (بەحیساب) نموونەییانە دانرابوو کە هێزێکی سیاسی لەپشت بوو بۆ ئەوەی بەهەر نرخێ بێ بتوانرێ ئەلف و بێ کەی باڵداری پێ وەلانرێ، کاتێ ئەو نوسخەیەم بەدەست گەیشت من لەهەموو شتێ بوو بوومەوە تەنانەت بەکتێبیش نووسینەکەم بلاّوکرابوویەوە بۆیە لەبەر خۆمەوە ئەوەندەم ووت بەرامبەر بە (٢١٢) مامۆستا، کورد ئەڵێ: (ئەی ویژدان سەگ بتخوا) بەرای من ئەوە ئەلف و بێ گۆڕین نەبووە، ئەگەر بەمانای گۆڕین حیسابی بۆ بکرێ بەڵکو لەشارێکی بچکۆلەی کوردستانێکی گەورەدا لەناو خەڵکێکی زۆر کەمی گەلی کورددا ئەوە تەنها دەست کاری کردنێکی سیاسی بووەو هیچی تر، وەمن دڵنیام ئەگەر رۆژێ لە رۆژان کورد لەخەو هەستێو ویژدانی خۆی راوەشێنێ هەست دەکات چ تاوانێکی بەرامبەر بەمرۆڤێکی دڵسۆز و بەبەرنامەی مرۆڤێکی راستگۆو هەروەها بەزمانی نەتەوەیەکی ژێردەست کراوە ئەوەیە (نا)ی (من).

# بە یادی مامۆستا باڵدار

ع، ع، شەونم

مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) ئەو زانایە یە کە توانی وێنەی ئەو دەنگانەی زمانی کوردی بگرێ کە لەپێش خۆیدا لە ئارادا نەبوون، چونکە نووسینە کوردیەکانی پێش ساڵی ١٩٥٠ ئەوە ئەسەلمێنن کە نووسینی زمانی کوردی کەم و کوڕی بووە و چەندان لە دەنگەکانی وێنەیان نەبووە یا با بڵێین پیتیان بۆ دانەنراوە نووسینی کوردی لە بەرەبەیانی مێژووەوە ئەو کەم و کوڕییەی بە سەلیقە پڕ کردووەتەوە، بۆ نموونە کە وشەی (کور)ی ئەهاتە بەردەم بە سەلیقە ئەیزانی کە ئەو وشەیە (کور)ە یا (کووڕ)ە چونکە پیتی (وو) هەروەها (ڕ)ی قەڵەو نەبوو تا وشەی پیّ دەستنیشان بکرێ. هەروەها کە وشەی (اگر)ی ئەبینی بە سەلیقە ئەیزانی ئایا ئەو وشەیە (ئاگر)ە یا (ئەگەر)ە.

ئەو پیتانەی لە ئارادا نەبوون و مامۆستا ئیبراهیم لە (ئەلف و بێ)کەیدا وێنەیان چەسپان ئەمانە بوون: (ئا، ئە، ئێ، ئی، ئۆ، ئو، وو،ی (پ)، درێژ، ۆ، ڕ، ڵ، ێ). یەکەمی سەرنج دان دەر ئەکەوێ کە رێژەی ئەو وێنە تازانە لە چاو هەموو پیتەکانی نووسینی کوردی دا نزیکەی سێ یەکە، دیارە نووسینێکیش کە لە سێ بەشی بەشێکی ناتەواو بێ‌و لە بوونا نەبێ، ئەو نووسینە هەر زۆر ناتەواوە، مامۆستا ئەو ناتەواویەی گەیاندە نیمچە تەواو، بۆیە ئەڵێم نیمچە تەواو، چونکە ئیستایش نووسینی کوردی هەر ناتەواوە، باس کردنی ئەو ناتەواویەش لێرەدا جێی باسکردن نیە. ئەوەی لێرەدا شایەنی باسکردنە ئەوەیە کە مامۆستا ئیبراهیم ڕۆژانە لە کاتی دانانی (ئەلف و بێ)یەکەیدا لە هەرکوێ دانیشتایە وەکو چایخانەکەی (حەمە ڕەق) و (حاجی عەول) و چەنان شوێنی تریش ئەهات ئەهات پەڕەکانی (ئەلف و بێ)کەی لە بەردەمیدا ڕائەخست و بڵاوی ئەکردەوە و ئەو پیتانەی لە هاتوچۆ کەران ئەپرسی کە دای نابوون و داوای لێ ئەکردن ڕای خۆیان دەربڕن و ئەگەر باشتریشیان بەبیرا دێت بی لێن و کەڵکی پێ ببەخشن، لەبیرمە جارێکیان داوای لە چەند کەسێکی شارەزا کرد ڕای خۆیان بەرامبەر بە پیتی (ی)ی درێژو (و)ی درێژو (ڕ)ی قەڵەو کە هەرسێکیان بە دووپات بوونەوە دانراون، هەر هەموویان بەباشی پەسەندیان کردو کەسیان نەیان توانی لە جێی ئەوانەی کە دووتوێ بوون، یەك توێ دانێن. لە کۆتایی ئەم یادەوەریەوە ئەڵێم نەوەکانی کورد وەچە لەدوای وەچە لەگەڵ فێربوونی خوێندن و نووسیندا بەردەوام یادی ئەم زانا داهێنەرە لەسەر بیرو زمان تۆمار ئەکەن بۆ هەتا هەتایە یادی بەخێر مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار).



# لە یادی مامۆستا ئیبراهیم باڵدار

ئەحمەد حسین ئەحمەد

ئەو ڕۆژگارانەی گەلی کورد ژێردەستەی قۆناغی خوێندن و پێگەیاندنی لە حوجرەی مزگەوتەکانەوە گۆڕاو بەرەو فێرگەهەنگاوی نا، لەپێش بیستەکاندا قوتابخانەی ڕوژدیەی عەسکەری و لەوە دواش قوتابخانەی نمونەی سەعادەت و مەحمودیەو لەتیفیەی دامەزران، گەلێك مامۆستای ناودار وانەیان تیادا دەوتنەوە. ساڵی ١٩٢٥ بەشێوەیەکی ڕەسمی ترو لەبارتر قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان و لەوەدوا کچانیش بەدوایدا هات و گەشەیان سەند. منداڵی کورد ئەودەم ئەلف و بێی کوردی نەدەخوێند تا ساڵی ١٩٢٧-١٩٢٨ لەلایەن پەروەردیاری کوردەوە مامۆستا ئەحمەد عەزیز ئاغاوە بۆ یەکەم جار ئەلف و بێیەکی کوردی کورت خرایە پرۆگرامی خوێندنەوە. لە ساڵانی سییەکانیشەوە مامۆستای گەورەو نوسەری بەتوانا حامید فەرەج ئەلف و بێیەکی فراوانتر لەوەی پێشوی بە وێنەی ڕەش و سپیەوە داناو ساڵانێکی زۆر جێگای خۆی کردەوە منداڵانی کورد پێی پێشکەوتن و مێژوویەکی باشی بۆ خۆی برەو پێدا. بەڵام لە ساڵی ١٩٥٠ بەدواوە جیهانی ئەلف و بێی کوردی لە ئاسۆیەکی گەشترو دەوڵەمەندترو هاوچەرخەوە لەسەر دەستی پەروەردیاری هەرە مەزن مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدار. ئەم زاتە لە ساڵی ١٩٢٠ لە گەڕەکی سابونکەرانی شاری سلێمانی لە دایکبوە سەرەتا لە حوجرەو پاشان خوێندنی سەرەتایی لە سلێمانی و دەورەی خانەی مامۆستایانی ریفی لە بەغداد تەواو کردووەو بوە بەمامۆستا. چەندان گوندی بەسەر کردۆتەوە و چۆتە دەرونی منداڵی کوردەوە بۆیە لەو مێژووەوە جوانترین ئەلف و بێی کوردی داناو خزمەتێکی بەربلاوی پەروەردەو منداڵی کوردی پێکرد کە تاکو ئێستایش کاریگەری هەر ماوە، مامۆستا ئیبراهیم باڵدار وازی لە خوێندن نەهێنا بەڵکو بو بەمودەریس و لەوە دواش چوو بۆ دەرەوەی وڵات لە ئەمەریکا پلەی ماجستێری وەرگرت لە زانکۆی سلێمانی و سەلاحەدین و بەغداد دەوامی دەکرد.

ناو بەناو لە گۆڤارە کوردی و عەرەبیەکاندا بابەتی پەروەردەیی بڵاو دەکردەوە. دوای ڕەنجێکی پرشنگدارو هیمەتێکی ماندو نەناسانە لە ١٩٩٨/٧/١٢ لە بەغداد دڵە گەورە کوردستانیەکەی لە لێدان کەوت و تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ سلێمانی و بە خاك سپێردا. بە ڕاستی وەك وەفایەك ئەبووایە لەهەر چوار شارە گەورەکەی کوردستاندا لە بەردەم دیوانی پەروەردەکاندا پەیکەری شکۆداری بۆ بکرایە تا دەستە دەستە نەوە دوای نەوە بە بینینی دەستیان بەسنگەوە بنایەو چەپکە گوڵی ڕێز و یادو مانەوەیان پێشان و پێشکەش بکردایە. کەچی بەداخەوە نەك تائێستا هەقی خۆی پێنەدراوە بەڵکو غەدر لە شاکارە مەزنەکەی (ئەلف و بێ) کوردیەکەی کراوە ماوەیەکە بێناز کەوتوە پەروەردیارانی دی کەڵکیان لێوەرگرتوە بەبێ ئەوەی ناوی ببەن.

سڵاو لە گیانی پاکی لە گۆڕی بێدەنگ و پیرۆزی، لەبەرهەمی نەمرو بە پێزی.

بە ڕاستی وەك وەفایەك ئەبووایە لەهەر چوار شارە گەورەکەی کوردستاندا لە بەردەم دیوانی پەروەردەکاندا پەیکەری شکۆدار بۆ مامۆستا (باڵدار) بکرایە تا دەستە دەستە نەوە دوای نەوە بە بینینی دەستیان بە سنگەوە بگرتایە.

# لە چلەی ماتەمینی پەروەردەکاری ناوداری گەلەکەمان ماموٚستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)دا*

مێژووی گەلان پڕیەتی لە سەروەری و ژیانی سەربەرزانەی کەڵەپیاوان و داهێنەران، کە هەم سەری نەتەوەکانی خۆیان بەرز کردۆتەوە و هەم ناوی خۆشیان لە مێژووی گەلەکانیاندا بەشکۆوە تۆمار کردووە.

گەلی ئێمەش ژمارەیەکی زۆر ڕۆڵەی دڵسۆزو کەڵەپیاوی تیاهەڵکەوتووە.

کە بە داهێنان و دڵسۆزی و لە خۆ بوردویی خۆیان، وایان کردووە کە هەمیشە ناویان لە لاپەڕە پڕشنگ دارەکانی مێژووی گەلەکەماندا بدرەوشێتەوە..

یەکێك لەوانە پەروەردەکاری مەزن ماموٚستا ئیبراهیم ئەمین باڵدارە کە دانەری کتێبی (ئەلف و بێ)ی کوردییەو نزیکەی نیوسەدەیەو هەتا ئێستاش نەوە یەك لەدوای یەکەکانی گەلەکەمان، یەکەم فرچکی خوێندەوارییان لە (دارا دوو داری دی)یەکەی ئەم مەزنە پیاوەوە نۆشی وە.

مەخابن ئەم ماموٚستا مەزنەی گەلەکەمان لەڕۆژی ١٩٩٨/٧/١٢دا گیانی پاکی سپاردو ماڵ ئاوایی لێکردین..

وەکو ئەرکێکی سەرەکی و بۆ شکۆمەندی و زانایی ئەو ماموٚستا تێکۆشەرە ناوەندی ڕاگەیاندنی مەکتەبی سکرتاریەتی یەکێتی ماموٚستایانی کوردستان کۆڕێکی ماتەمینی بۆ چلەی ماموٚستای خوالێخۆش بوو (ئیبراهیم باڵدار) لە هۆڵی یەکێتی ماموٚستایانی کوردستاندا سازدا.

*سەرەتا کۆڕەکە با دەقیقەیەك وەستان بۆ گیانی پاکی شەهیدانی کوردستان بەگشتیو ماموٚستایانی شەهید بەتایبەتی دەستی پێکرد.

پاش خوێندنەوەی چەند ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز لە لایەن ماموٚستا (عەدنان سەیوانی)یەوە.

شامۆمی تەمەنی ماموٚستای خوالێ خۆش بوو لە لایەن چەند ئەندامێکی بنەماڵەکەیانەوە داگیرسێنرا.

دوا بە دوای خوێندنەوەی ژیان نامەی پڕ لە سەروەری ماموٚستا (باڵدار).

بەڕێز ماموٚستا عەبدولرەحمان محەمەد ئیسماعیل سەرۆکی یەکێتی ماموٚستایانی کوردستان وتارێکی پێشکەش کرد.

دوای ئەوە بەڕێز ماموٚستا مەجید ئیبراهیم ئەندامی مەکتەبی سکرتاریەت چەند بیرەوەرییەکی خۆی لەگەڵ ماموٚستای خوالێ خۆش بوو باس کرد.

ئینجا پەخشانێك لە لایەن ماموٚستا محەمەد شێخ عەلی قەرەداغییەوە بە ناو نیشانی (باڵدار ئەو کۆچ کردووەیە کە بەرهەمەکانی ناهێڵن کۆچ بکا) پێش کەش کرا.

دوای ئەوە وتاری ماموٚستا عەبدوڵڵا سور هاوڕێی دێرینی ماموٚستا باڵدار خوێندرایەوە.

دوا بە دوای ئەوە پەخشانێك بەناونیشانی (چەند پەیڤێك بۆ مەشخەڵی شاڕێگەی پێش کەوتن) لە لایەن ماموٚستا (عادل جواد)ە وە پێش کەش کرا.

پاشان پەخشانێك لە لایەن ماموٚستا (سەرگوڵ نەجمەدین)ەوە بە ناونیشانی (بۆ پێشەواو دانەری کۆلکە زێڕینەی ئەلف و بێی کوردی) خوێندرایەوە.

چەند بروسکەی ماتەمینی کە لە لایەن دەزگا حزبی و ڕێکخراوەیی و حکومییەکانەوە نێردرابوون خوێندرانەوە.

شایانی باسە کۆڕەکە لە لایەن کادرانی ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتی ماموٚستایانی کوردستان (سابات محەمەد و عادل جواد)ەوە بەڕێوە چووە.

* وەك وەفایەکی درەنگ وەختو بە مەبەستی هەرچی زیاتر ئاسودەترکردنی ویژدانی خۆمان هەوڵمان داوە ئەوەندەی کە دەستکەوتبێ لەو نوسینانەی کە لەسەر ماموٚستای دڵسۆز و خۆنەویستمان بڵاوبونەتەوە لێرە وەکو خۆی بڵاومان کردونەتەوە، لەلایەکی تریشەوە بە مەبەستی پیشاندانی ئاستی وەفای ئێمە بەرامبەر بەوزاتە گەورەیە کە هەمیشە بەرامبەر گەلەکەی خۆی وەفادار بوو.

## بۆ ئەو مرۆڤەی کە هەموومانی بە دنیای خوێندن ئاشناکرد کەچی هێشتا هەر نایناسین..!!

ماموٚستا عەبدولرەحمان محەمەد ئیسماعیل

وڵاتی منیش، وەکو وڵاتی سۆڤیەتی ماکارنیکۆ و، فەرەنسای ژان ژاك ڕۆسۆ، و ئەسپانیای پاپلۆ بیکاسۆ، پەروەردەکارو کۆمەڵناس و هونەرمەندی هەیە.

نیشتمانی منیش، وەکو نیشتمانی چینی کۆنفۆشیۆس، و لیبیای عومەر موختارو، کوبای کاسترۆ، نیشتمانپەروەرو وڵاتپارێزی تیا هەڵکەوتووە.

کوردستانی منیش، وەکو هندستانی غاندی و، ئەفغانستانی جمال الدین و، داغستانی هەمزاتۆف، دانا و زانای بەخۆوە دیوە.

ئەوان لە کۆمیدیاو بەزمەستانەکانی ناودارانی خۆیاندا، شایی گێرو شادی هێنەرن.

لە تراژیدیاو مەرگەساتەکانیشدا یاد ئاوەروماتەمگێڕن. ناودارەکانیان ناودارتر دەکەن و لە تۆمارگەی نەمراندا ناو زەدیان دەکەن. تەنانەت خەڵکانی ئەوان بەر لە مردنیان وەسیەتی ئەوە دەکەن، کە لە نزیک گۆڕستان و ئارامگەی شاعیران و پەروەردەکاران و مێژوو نووساندا بیان نێژن.

ئەو ڕۆژەی باڵدارەکەی ئێمە چاوی لێك ناو بۆ دوا جار ماڵئاوایی لێکردین. نەك هەر ئەو ڕۆژە، نەك ڕۆژی دوای ئەو ڕۆژەش،نەك ڕۆژانی دواتریش، تەنانەت تا دوێنێش... بگرە تا ئەمڕۆش، ڕاگەیاندنی وڵاتەکەم لە خەمی ئەو کەڵەپیاوەدا نەبوون و، لە پرسەیدا ماتەمگێڕ نەبوون. ڕەنگە تا ئەم ساتەش هەندێك هەر ئاگایان لەوە نەبێ، کە باڵداری شۆڕەسواری پەروەردە سەفەری بێ گەڕانەوەی ڕاگەیاندبێ..!!

دوور لە هەر شۆڤینیستی و دەمارگیری نەتەوەیش، ئەوەتا لەو چل ڕۆژەی دواییدا، لە جیاتی ئەوەی باڵداری مەزن لە گەشتی خواحافیزی دواجاریدا، سەر بە یەکە یەکەی ماڵانی کوردستاندا بکرێ، کەچی لە جیاتی ئەو، کاظم الساهر و دیسکۆ دانسەر و ابراهیم تاتلی سازو نۆش ئافەرین خانم قارەمانی شاشەکان وون..!!

کە ئەهریمەنی شەڕی (یەکەم جەنگی جیهانی) یەخەی دنیای مرۆڤایەتی بەردا. لە گەڕەکی سابونکەرانی دەست فرۆشاندا، منداڵێکی چاوگەش چاوی بەکۆلکە زێڕینەی ئاسمانی ئەو دەڤەرە هەڵهێنا، هەر بە زوویش بۆ پیتی گۆنا گۆن و، وشەی سادە و قەشەنگ لە باڵەفڕێ دابوو، تا وردە وردە باڵی گرت و بوو بە (باڵدار).

باڵداری زاناو دانا، کتێبی ئەلف و بێی کوردی دانا لە حەزو ئارەزووی منداڵانەوە وێنەکانی کێشا، لە سروشتی ڕازاوەی کوردستانەوە گوڵ و ڕیحانەی چنی.. لە پەلکە زێڕینەی پاش بارانی زۆری بەهارانەوە پیتی ڕەنگینی هەڵبژارد.. لە فۆلکلۆرو کەلەپووری باوك و باپیرانەوە ڕستی ڕۆژانەی هۆنیەوە.. لە ئازایەتی و جوامێریی میللەتەوە هەڤپەیڤینی ساز کرد و، لە مۆسیقاو هەڵپەرکێی کوردەواریشەوە سەرچۆپی فێرکردنی گرت:

دارا داری دی.  
ئەوە ئازادە دۆی دەوێ  
ئێستا سێ سێوان بەردەدەمەوە  
کەوی من کەوێکی ئازایە



دەی ئازاد، بلوێرلێدە، سەیرانە
بلوێرەکە باش لێدە گیانە
نەسرین چا لێدەنێ و پێ دەکەنێ
نێرگز پیاڵە دەشواو ستران دەبێژێ
وا دەست دەکەین بە ئاوازی نیشتمان
ئاوازی شیرینی کوردستانی جوان

پەروەردەکاری بلیمەتمان، فرە زرنگ وزیرەکانە، گەلێ بە توانا و وەستایانە، لە هەر باخێکەوە گوڵێکی هەڵبژاردو کردی بە چەپکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگی ئەلف و بێی کوردی.

شاکارەکەی باڵداری مەزن، کە نزیکەی نیو سەدەیە، هزرو بیرمانی پێ زاخاو دراوە و لە گوێی گەورە و بچوکی ئەم کوردستانەدا دەزرنگێتەوە...

بێ شک لەم قۆناغەدا و بۆ داهاتووش هەر دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگی (پەروەردەی هاوچەرخ) کە لەگەڵ هێڵە گشتییەکانی چەرخی ئەلکترۆن و کۆمپیوتەر و، ئەنتەرنێت و هەموو پێشرەفتە تەکنۆلۆژییەکانی دیکەدا بسازێ.

ئەی مامۆستای مامۆستایان...

ئەی باڵداری بەرزەفڕ:

سەرتاپای خەڵکی کوردستان وا مەدارو قەرزاری ئەتۆی کامەران..

خۆ ئەگەر: لە ژێر هەرگەزە ئاسمانێکی ئەم نیشتمانەدا، لەسەر هەر بستە خاکێکی ئەم کوردستانەدا، لە بەردەم هەربنکە و دەزگایەکی پەروەردەییدا پەیکەری ئاڵتونیشت بۆ دروست بکرێت... هێشتا بارتەقای ئەو شاکارە ناودارەت نابێ..

هۆ خاوەنی:

هۆ هۆکاکەی شمشاڵ ژەن گیان ئاوازی هەی گوڵ لێنادەی بۆمان خاتر جەم بە، مامۆستایان و پەروەردەکارانی وڵاتەکەت، پشتاوپشت لە ئەرشیفی مێشك و بیریاندا دەتپارێزن، قەتاوقەت لەبیرت ناکەن... هەر لە ژێر شاباڵی پەروەردەیی تۆشدا، درێژە بە کاروانی فێربوون دەدەن. بێ شك ئەو ئالایەش کە تۆ هەڵت کردووە، هەرگیز نایەڵن بکەوێتەوە سەرزەوی..

## چەند بیرەوەرییەك (مامۆستا مەجید ئیبراهیم رەزا)

لە ساڵی ١٩٧٠ پاش بەیانی ١١ی ئازار چوار مامۆستای بەڕێزی شاری سلێمانی هاتن بۆ شاری خانەقین بۆ کردنەوەی خولی فێرکردنی زمانی کوردی بۆ مامۆستایانی خانەقین، بریتی بوون لە مامۆستایان (کریم زەند)و (محمد عبدە) و (شێرکۆ احمد شوقی) و (فوئاد صراف). یەکەم ئاشنایەتیم لەگەڵ خواڵێخۆشبوو (ابراهیم امین باڵدار) لە ڕێگای کتێبی (ئەلف و بێ)یەکەیەوە بوو کە لەو خولەدا بەڕێز مامۆستا (شێرکۆ احمد شوقی) پێی ووتینەوە، لە ڕێگای ئەو پیت و ووشانەوە بەغیابی خۆی پەیوەندییەکی ڕووحیم لەگەڵ مامۆستا (باڵدار)دا وە پەیداکرد.

١-لە ٢٣ تەمموزی ١٩٧٣دا ئەڵقەیەکی لێکۆڵینەوە لەسەر چۆنیەتی دانانی کتێبی کوردی لە شەقڵاوە بەسترا، ڕێکەوت لەگەڵ مامۆستا (باڵدار)دا لەو کۆبوونەوە ڕووناکبیرییەدا لە یەك ژووردا لە ئوتێلی (خانزاد) کۆی کردینەوە و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ توانیم بەهرە لەو مامۆستا پایە بەرزە وەربگرم بە تایبەتی منی خانەقینی تینووی ووشەی پیرۆزی کوردی و مەحرووم لە هەموو شتێك بۆنی کوردو کوردایەتی لێ بێت بەهۆی سیاسەتە ڕەگەز پەرستانەکەی ڕژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق و بەڕێکەوتیش لە گەڕانەوەماندا لەگەڵ خواڵێخۆش بووان (باڵدار) و (د. کامل بصیر) پێکەوە لە ترۆمبیلێك دا بۆ شاری سلێمانی گەڕاینەوە و لە نێو سەیارەکەدا بە باسی ووشەی کوردیدا لەگەڵ ئەو بەڕێزانەدا هەر خەریك بووین.

٢-پێش کارەساتەکەی ٣١ی ئاب دوو جار لە هەولێر بەدیداری خواڵێخۆش بوو (باڵدار) شاد بووم، کە لە هەر دوو جارەکەدا تەشریفی بۆ دیوانی وەزارەتی پەروەردە هێنا بوو لەو دوو دیدارەدا باسی کتێبی (ئەلف و بێ)مان کردو ترسی ئەوەی بوو کە ئەو کتێبە بگۆردرێت و منیش بەڵێنی ئەوەم پێیدا کەشتی وا لە ئازادانییە و ئەو کتێبە بەنرخەی ئەو کەدەیان ساڵە منداڵە چاوگەشەکانی کوردستان پێی گوێش دەکرێن جێی خۆی کردۆتەوەو کەس گلەیی و گازندەی لێ نییە. خواڵێخۆش بوو خەمی ئەوەی نەبوو کتێبەکەی ئەو پشت گوێ بخرێت، بەڵکو خەمی ئەوەی لێ هاتبوو کە منداڵانی کورد زەرەر مەند بن.

## چەند پەیڤێك بۆ مەشخەڵی شارێگەی پێشکەوتن

چل ڕۆژ لەمەوبەر لە ڕۆژی ١٩٩٨/٧/١٢دا..

مامۆستایەکی داهێنەر و بە ئەزموونی گەلەکەمان، دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت و سۆمای چاوی جەماوەرێکی زۆر لەگەڵ کوردستانی جێ هێشت کە سەرجەم ئاشنای دەوری گرنگی لە مێژینەی ئەو کەڵە پیاوەن و کەلێنێکی دیارو بەرچاوی لە ناخ و دەروونی مامۆستایان و پەروەردەکاراندا بەجێ هێشت.

ئەی مامۆستای بە ئەمەك و دڵسۆزی گەلەکەم:

تۆ باران بوی و ساڵانێکە تینوویی‌یەتی زەوییە و شکەکانی دەرونمان بە (دارا دوو داری دی)یەکەی تۆ پاراو دەبێ..!!

ساڵانێکە تۆ خۆرێك بویت و هانات بە بەر جەستەیی تەزیوو بێ بەرگەکاندا هێناوەتەوە..!

ساڵانێکە مەشخەڵێك بووی، شارێگەی پێشکەوتنت بۆ باپیرانمان و بۆ خۆمان بۆ ڕۆڵەکانیشمان ڕووناك کردۆتەوە..!

تۆ بۆ سەردەمی خۆت و بۆ دوای خۆشت پێشمەرگە بوی و لە تاریکستانی شەوە زەنگا جەنگاویت..

ساڵانێکی دوورو درێژە، بویتە بینایی چاوە نابیناو ئەنگوستەکان.. لەم هەرێمەی کوردستاندا: کام سەرکردە، کام ڕۆشنبیر، کام زانا کام خاوەنی ماجستێرو دکتۆرا هەیە..؟

یەکەم ووشە کە یەکەم جار فێری بووبێ (دارو دارا)کەی، کتێبی (ئەلف و بێ)کەی تۆ نەبووبێ..!

ئێمـــەی ئێســـتا و بـــاوانی ڕابردوومـــان و ڕۆڵـــەکانی دواڕۆژیشمان هەر هەموومان قەرزاری تۆین..

قەرزاری تۆی چرای درپێدەری تاریکی-تۆی مەشخەڵی، تۆی ڕێپیشاندەرو پێشەنگ..!

عادل جواد

## بۆ پێشەوا و دانەری پەلکە زێڕینەی ئەلف و بێ ی کوردی

هەموو ساڵێ کە دەرگای قوتابخانە سەر لە نوێ ئەکرێتەوە. منداڵـە سـاواکانی ئـەم کیشـوەرە بـە کتێبـە کوردیەکـەی تـۆوە خۆشی و شادیانە یەکەم وانەی لێو ئاڵم زمانیات بە داراو دۆی دادە ئەکرێتەوە. هەر ئەو مامۆستایەی کە وانەی تۆ ئەڵێتەوە، تا دوێنێ ئەویش هەمان منداڵی چاوگەشی ئەم نیشتمانە بوو، تۆش مامۆستای هـەموومانی تۆ شۆڕشی و زمانی کـوردی و ووشەی پاراوی ئەم گەلەیت، من کە ئێستا لە ژیاندام پێشەوام تۆ بووی، فێری گەورەترین ووشەی کوردی و ناسینی هەموو پیتەکانی زمانی کوردی یت کردووم.

ئەی ڕابەرم تۆ سەرچاوەی دروست بوونی ئەم کەڵە پیاوانە بووی هەر لە پزیشك و ئەندازیارو مامۆستاو سەرکردە. ئەی پێشەوام تۆ هەرگیز نامری ناوت لەسەر زمانی منالآنی شەش سالآندا تا گەورە پیاوان هەر ئەوتریچتەوە، ئەی دانەری کتێبی (ئەلف و بێ)ی ڕەسەنی کوردی. کتێبەکەت دیاریەکی گەورە و بەکەڵکم هەتا هەتایە هەرگیز لە ناو ناچێ ئەو کتێبە پڕ لە ووشە تەڕو پاراوانەت ئەی مامۆستام بلیمەتی کورد تۆ یەکێك بووی لە شۆڕە سوارانی ووشەی کوردی، بیرت لە دانانی ووشە و پیتی کوردی ناسك کردەوەو بۆ منالآنی ئەم کوردستانە هەموو منالآن و کەڵە پیاوانی کورد قەرزار باری تۆی سەروەرین.

ڕۆحت شادو جێگات بەهەشتی بەرین بێت.

نووسینی:

مامۆستا سەرگوڵ نجم الدین

## به بۆنەی:

## چلەی مامۆستا ئیبراهیم باڵدارەوە

مامۆستا: عبدالله محمد امین/سەرپەرشتیاری پەروەردە

به ناوی خوای گەورە

ڕێزداران .... ئامادەبووانی کۆڕی چلەی، بەهەق مامۆستای پەروەردە مامۆستای بەهرەوەر... مامۆستا برلیم باڵدار...

ئامادەبوو... ـەم کۆڕەدا، وەفاداری و ڕێزدانانتان بۆ پەروەردە و مامۆستای کۆ کردوو دەسەلمێنێ.. مامۆستای بە توانا.. مامۆستای زانست و پەروەردە، مامۆستای داهێنەری نوێی ڕێنووسی خوێندنەوەو نووسینی کوردی... مامۆستای دانەری ئەلف و بێی نوێ و شوێنکەوتووی ڕێبازی تازەی پەروەردە... مامۆستا برایم باڵداری ئلشنا بەگوێجکەو دڵی گشت مندالآنی چیاو دۆڵ و دەشت و کەلای کوردستان!.. هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەی بۆ بکرێت کە قوتابییانی لە ژمارە نەهاتووی.ز. چەندین کـۆڕو سـیمنار و مێزگـەری... بـۆ ڕاو بۆچـوونەکانی و لێکۆڵینـەوە پەروەردەییـەکانی سـاز بکـەن و هـەر لـەم ڕێگایانەوەش خۆزگەو واتەکانی دڵ بهێننە دی...

بەڕاستی و ڕاشکاوانە دەڵێم: بیری نوێکردنەوەی پرۆسەی پـەروەردە و شـوێنکەوتنی سیسـتمی پـەروەردەی تـازە... بە دەنگی زولاڵی ئەم کەڵە پیاوە یەکەم جاڕی بۆ دراوە چونکە ئەم! تاکو ئێستاش لە بواری پەروەردەدا تاکە کەسە لە ڕووی زانستییەوە پسپۆڕێتی و کارامەیەتی وە دەس هێنا بێت...

بەڕێزینە... ئا لەو سەردەمەدا، کە نەخوێندەواری بڕستی کوردستانی بڕیبوو.. بەڵێ ئا لەو کاتەدا کە خوێندنەوەو نوسینی کوردی سەرلێشێواو بوو!.. هەر نووسەرە بە ئارەزووی خۆی نووسینەکەی هەر جارە: بەڕێنووسی عەرەبی ئامێز یا فارسی ئامێز... یا بە شێوازی جۆراو جۆری کوردی بلاودەکردەوە... ئا لەو سەردەمەدا کە مندالآنی پۆلی یەکەم هێماو دەنگی پیتیان لە ڕستەو دەستەواژەی وەك: (لووت.. بزووت.. ماڵمان دەڕوا بۆ بێروت)ەوە هەڵدەهێنجاو بە خوێندنەوەو نووسینی گرانەوە دەجەڕان و ماندوو دەبوون...

وەك خۆی دەڵێ: ئا لەوکاتەدا، مامۆستایەکی بە پەرۆش و داخ لە دڵ.. مامۆستا برایم ئارەزوو خوولیای دانانی (ئەلف و بێ)یەکی شیاو بە مندالآنی کورد، کەوتە سەری... هەر لە سالّی (١٩٤٠)ەوە کە کراوە بە مامۆستا عەزمی جەزم کردووە کە ڕێگا چارەیەك بدۆزێتەوە تا مندالآن بە ئاسانی فێری خوێندنەوەو نووسین بن و لەدەس ئەم پشێویە و ئاڵۆزییە ڕزگار بن...

ئیتر ئەوە بوو لە سالّی (١٩٤٨)دا بوواری بۆ ڕەخساو هەر کە بوو بە مامۆستا لە دێی (جاسەنە)ی سەر بە ناوچەی سووڕداش، ڕۆژانە لە ناو باخەڕەنگینەکانی ئەم دێیەداو شەوانەش لە بەر چرای دیوارکۆدا خۆی شەکەت و هیلاك دەکردو پیت و شەو ڕستەی لە یەکدەدان و چەند جارە ئاڵوگۆڕی دەکردن، تا بە دڵی خۆی وشەو ڕستەی لێدەهێنانە بارو وای لێدەکردن کە دەبوونە گەوهەری شیاوی ناو (ئەلف و بێ) چاوەڕوانکراوەکەی... جا بۆ ئەوەی کێشەی بۆ پەیدا نەبێت... پێش هەموو کارێك... دەستووری ڕێنووسێکی وای داڕشت... خوێندنەوەو نووسینی بە تەواوی ئاسانکرد... وە بە دوایدا بەم ئاسانکرد... وە بەدوایدا بەم شێوازە کارەکانی بە ئەنجام گەیشتن:

١-لـه سـاڵی ١٩٤٩دا (ئـەلف و بـێ)یەکـەی تـەواو بـوو، وەزارەتـی مـەعاریفی ئەوسا بڕیاری لە چاپدانی دا... لەساڵی ١٩٥١ بە چاپخانەی (نجاح) لە بەغداد چاپکرا.

٢-لەساڵی ١٩٥٣ دا پاش هەندێ دەستکاری و گۆڕانکاری و ڕەچاوکردنی تێبینی شارەزایانی سەردەم، بۆ جاری دووەم لەژێر ناوی (ئەلف و بێی نوێ بۆ منداڵان) چاپکرایەوە..

٣-لەساڵی ١٩٥٥ دا ئەلف و بێ یەکی تایبەت بە گەورەی دانا.

٤-لەساڵی ١٩٥٦ دا، کتێبی (ئەلف و بێی نوێ بۆ منداڵان) پـاش دەستکاری و گۆڕانکـاری بـە وێنـەی ڕەنگـاوڕەنگی ژنـە هونەر مەندی ئەڵمانی (تروودی میتلمان) لـە چاپخانەی رابطة چاپکرایەوە..

٥-ئیتر لەو کاتەوە بەرو دوا چەندین جار لەسەر پێشنیازو تێبینـی لیژنـەکانی پسـپۆڕی تایبـەت بـە ئـالف و بـێ (اللجان العلمیـة المتخصصـة للالفبـاء)بەڕێوەبـەرێتی دراسـەی کـوردی پاش پوختەکاری سەر لە نوێ لەچاپی دەدایەوە.

*مامۆسـتا بـرایم هـەر کەلـە سـاڵی ١٩٥٢ لـە بەڕێوەبـەرێتی پرۆگـرام و هـۆی فێرکـردن (مدیریـة المنـاهج و الوسـائل التعلیمیـة) لـە دیـوانی وەزارەت دامـەزرا، ئـەرکی سەرپەرشـتی کردنی: دانان و چاپکردن و پوختە کردنی کتێبە کوردییەکانی قوتابخانەکانی کەوتە سەر شان و ڕۆڵێکی زۆر کاریگەری بینی لە ڕێکخستنی شێوازی ڕێنووسیاندا.

*بـەهۆی هـەوڵ و تەقـەلای مامۆسـتا برایمـەوە چـاپخانەی (نـەجاح) و چاپخانەی تر قالبیـان لـە دەرەوەی عێراق هێنا بۆ ئەو پیتانەی کە لە عەرەبیدا نەبوون.

*مامۆستا برایم کەلە زانکۆی سلێمانی بوو زۆر لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی لەسەر بابەتە پەروەردەییەکان لەڕێگەی گۆڤاری زانکۆوە بەئەنجام گەیاندووە.

لەوانـەش لێکۆڵینەوەیەکـە لەسـەر: ئامـادەبوون بـۆ خوێندنەوەو نووسین کە لریتیە لـە سیستمێکی پـەروەردەیی تازەی تایبـەت بە منداڵانی پۆلی یەکەم وە ئەم شێوازە تازەیە ئێستا تا ڕادەیەکی چاك پەیڕەو دەکرێت.

مامۆسـتا بـرایم تـا دوا هەناسـەی ژیـانی زۆر بایـەخی بـەم لایەنـە دەدا و هەمیشـە لێـدوان و نووسـینی لەسـەر پێشـکەش دەکرد.. تا دواجار کتێبێکی لەسەر ئەو بابەتە بەم ناونیشانە بە عەرەبی دەرکرد للقراوە و (للاستعداد الکتابة).

لێکۆڵینەوەیـەکی تـری بـە ناونیشـانی (هەنـدێ لـە پێداویسـتیەکانی بەرنامـەی فێرکردنـی منـداڵ -بعـض إحتیاجیات برامج تعلیم للاطفال) لە گۆڤاری زانکۆدا پێشکەش بە خوێندەواران کرد..

*لەسـاڵی ١٩٦٨ دا بـووە بەرپرسـیاری نەخشەکێشـانی بەرنامەو کتێب لە دیوانی وەزارەتی پەروەردە.. ئەمە بووە هـۆی ئـەوەی دەوری کاریگـەری هـەبێ لـە دانانی پرۆگرامـی قۆنـاغی باخچەی ساوایان و پرۆگرامی قۆناغی سەرەتاییدا... ئەتوانم بڵێم: بەشێوەیەکی تێکڕایـی ڕۆڵـی کاریگـەری هـەبووە لەسـەر گۆڕانکاری پرۆسەی پەروەردە لە عێراق و کوردستاندا..

*لێکۆڵینەوەیـەکی زانسـتیانەی لەسـەر مەڵبەنـدی هـۆی فێرکردنـی پێشـنیارکراوی بـۆ زانکـۆی سـلێمانی لـە ڕێگـەی گۆڤاری زانکۆوە بە ئەنجام گەیاند..

*ئەگـەر ووردبینانـە سـەرنج لـە لێکۆڵینـەوەو توێژینـەوەو موحـازەرە پڕسـوودەکان بـدەین ئـەبینین کـە هـەموویان جـەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە زۆر بە بایـەخ و پەرۆشـەوە ڕوانیویەتیە قۆناغە باخچەی ساوایان و قۆنـاغی سـەرەتایی وە هەمیشـە لای وابووە کۆمەڵگای کوردەواری کاتێك بەرەو گەشـەو پێشـکەوتن دەچێت کە وەکو پێویست بایەخ بە قۆناغی باخچەی ساوایان و قۆناغی سەرەتایی دەدرێت.

*مامۆسـتا برایمـی ئوسـتادی کـۆلێجی وێـژە لەگـەڵ بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی سلێمانی پەیوەندی و هاوکاری زۆر چاکی هەبووە، لەگەڵ لیژنەی پسپۆڕی تایبەت بە (ئەلف و بێ) تەواو هاوکار بووە، هەمیشە داواکاریەکانی ئەم لیژنەیەی جێ بـەجێ دەکـرد و بەلێـدوانی (محـازەرە) تێـرو تەسـەل و پەروەردەییانـە کاریگـەری خـۆی لەسـەر نـاخ و دەروونـی مامۆستایانی پۆلی یەکی گشت ناوچەکانی پارێزگای سلێمانی بەجێ دەهێشت...

*ئەڵێن لە زۆربەی وڵاتە پێشکەوتووکاندا ئەگەر مامۆستای قۆنـاغی ناوەنـدی و بـەرەو ژوور ، چـەند سـاڵێك لـە قوتابخانـە سـەرەتاییەکاندا مامۆسـتایی نەکـەن و بڕوانامـەی (تأهیـل) وەرنـەگرن... نایـەڵن لـە قۆنـاغی ناوەنـدی و بـەرەو ژووردا مامۆسـتایەتی بکـەن..! بەڕاستی ڕۆڵـی کـاك برایمـی باڵـدار ی قاڵبوو و لێهاتوی بواری پەروەردە ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ... ئـەم مامۆسـتایە... بەهـەق یەکـەم بڕوانامـەی پـیرۆزی مامۆستایەتی بە دەست هێناوە...

بەڕێزینە... پێویست ناکات مامۆستا برایم باڵدار بە کەس بناسێنین و داوا بکەین ڕێزی لێبگیرێ... چونکە تا دنیا مابێ و پۆلی یەك هەبێت لە کوردستاندا و دەنگی پیتە کوردییەکان لە ژوری ئەم پۆلانەوە بەرز بێتەوە... ئەوا هەمیشە چواردە پیت یـەك ئـەگرن و ووشـەی (ئیـبراهیم باڵـدار) دروسـت ئەکـەن و ئـەمیش وەك ئـەبو خەلـدون ... هەمیشـە خالـد دەبێـت... بەڕێزینە... پێش ئەوەی بێمە کۆتایی پێشنیازدەکەم (گۆڤاری پـەیامی مامۆسـتا) ی ژمارەی داهاتوو تایبـەت مەند بێت بـە مامۆستای هەڵکەوتووی پەروەردە... مامۆستا برایم باڵدار... لەگەڵ ڕێزدا...

## کورتەیەک لە مێژووی ژیانی مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدار

ئامادەکردنی: محمد عەلی قەرەداغی

مامۆستای خوا لێخۆشبوو لەساڵی ١٩١٩ دا لەگەڕەکی سابونکەران لە سلێمانی دا چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، هەر لەم شارەدا خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە دوای ئەوە بۆ خوێندن چووە بۆ بەغداد، (دار المعلمین) ی ریفی لە ساڵی (١٩٣٩-١٩٤٠) تەواو کردووە.

لە دوایدا بووە بە مامۆستا لە قوتابخانەکانی قەمچوغە، تەوێڵە، ناو شاری سلێمانی دا. بە دڵسۆزی و لەخۆ بردوویی کارەکانی خۆی ئەنجام داوە، لە دواییدا گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەی (امیر عبد الاله) مامۆستا ابراهیمی ئەمر لەسەرەتای دامەزراندنی بە مامۆستایی خولیای دانانی (ئەلف و بێ)یەکی نوێ لەسەر شێوازێکی پەروەردەیی کە لەگەڵ خواست و ئارزووی منداڵاندا بگونجێت، هیواو ئامانجی بوو. وە بوو بوو بە خولیا لە مێشکیدا چونکە مامۆستای بەڕێز هەر لە منداڵیەوە کە لە پۆلی یەکەم بووە بەو کتێبی ئەلف و بێیە فێربووە کە خوالێخۆش بوو، (ئەحمەد عزیز ئاغا) دای نابوو. هەر چەندە ئەو کتێبە بۆ ئەو کات و زەمانە هەنگاوێچکی مەزن و کارێکی نایاب بوو وەشایانی ڕێزلێنان بوو، بەڵام کە بیری ڕستەکانی ئەو کتێبەی ئەکردەوە نەی ئەزانی چۆن فێربووەو مامۆستاکەی چەندین ئەرک و زەحمەتی پێوە کێشاوە، چونکە ڕستەکانی لە ڕووی ماناو ڕێنوسەوە تەواو نەبوون، بۆ نموونە ئەمە چەند ڕستەیەکی ئەو کتێبەیە (ملی عارف لووی هەیە، قاقەز بەلوولەیە، باری زەل بە دوو قرانە) ئەم ڕستانە تایبەتن بە فێرکردنی پیتی (لام)ل هەروەها (اطفا ئەو قەڵەمەم بدەرێ، ذاتاً چاوم پێ دەکەوێت، بعظا خراپ چاکە، بعظا، فائز شرعاً جائز نیە، لطفاً لێی پرسیم، جداً درۆ ناکات) دوای ئەو کتێبەش کە ناوەڕاستی سییەکاندا خوالێخۆش بوو (حامد فرج) هەنگاوێکی تری بەرەو پێشەوەی نا بۆ دانانی کتێبێکی تازەی (ئەلف و بێ) بۆ منداڵان، ئەمەش کە تا پێش ئەو کاتەی مامۆستا باڵدار ئەو کتێبەی خۆی دانا لە قوتابخانەکاندا دەووترایەوە بەڵام ئەمیش بە دڵی ئەو نەبوو، بەڵکو ئەو پرۆژەیەکی مەزنتری لە مێشک دابوو، لەبەر ئەوە کەوتە خۆی و کۆکردنەوەی ئەو ڕستە و ووشانەی کە لە دەوروبەری منداڵاندا هەیە و بە حەزو ئارەزووی منداڵانەو لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاریان ئەهێنن.

ئیتر ئەو کارە وای لێ کردبوو شەو و ڕۆژ بۆ ووشەی جوان و سادە ئەگەڕاو، لێرەو لەوێ ئەیپرسی تا پرۆژەکەی گەلاڵە بوو، دوای ئەوە لەسەر داوای خۆی گوێزرایەوە بۆ قوتابخانەی چوارتا.

لەوکاتەدا خوالێخۆش بوو مامۆستا (عبدالمجید حسن) بەڕێوەبەری (معارف)ی سلێمانی بوو بەم کارە مەزنەی زانی لە پاداشتی ئەوەدا کە زیاتر لە کارە بەدەستانی وەزارەتی معاریفەوە نزیک بێت، هەوڵیدا نقلی بغداد بوو، وە لە بەڕێوەبەرێتی بەرنامەو کتێب بە فەرمانبەر دانرا. مامۆستا باڵدار لەگەڵ ئەوەی کە لە هەوڵدانی بۆ تەواو کردنی کتێبەکەی هەر لە کاردا بوو ئێوارانیش لە کۆلیجی بازرگانی ئابووری ئەی خوێند، لەو ماوەیەی کە لە بغداد بوو سەردانی وێنەکێش و خۆشنووسە بەناوبانگەکانی بغدادی ئەکرد وەکو (هاشم الخطاط) و ((صبری الخطاط) کە خۆشنووسی تایبەتی (بلاط) بوو، لە ئەنجامدا وێنەکێشێکی بیانی کە ناوی (ثرودی میثل مان) بوو دۆزییەوە. وێنە ڕەنگاوڕەنگە جوانەکانی کتێبەکەی بۆ نەخشاندو کتێبەکەی ڕوونیاکی دی‌و لە لایەن وەزارەتی معاریفەوە پەسەند کراو بڕیاری خوێندنی درا. کە تائێستاش دەیان جار چاپ کراوەتەوە لە قوتابخانەکاندا ئەخوێنرێت.

هەموو منداڵێك کە لە کوردستاندا لە دایك دەبێت و دەچێتە قوتابخانە کە زمانی بە ووشە جوانەکانی کتێبەکەی باڵدار پڕاوە وەفێری خوێندن و نووسین بوو قەرزاری باڵدارە.

دوای ئەوەی ئەوکارە مەزنەی بە ئەنجام گەیاندو کۆلیجی بازرگانی و ئابووری تەواو کرد، چوو بۆ امریکا لەوێ پاش دوو ساڵ بڕوانامەی (ماجستێری) وەرگرت لە پەروەردە و دەروونزانیدا. کە گەڕایەوە بوو بە بەڕێوەبەری بەرنامەو پەڕاو لە وەزارەتی پەروەردە لەو ماوەیەی کە لەم پۆستەدا بوو جێ دەستی دیارە. لەو گۆڕانکاریانەی لە بەرنامەو پەڕاوی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندیدا کرا. کە زانکۆی سلێمانی کرایەوە بوو بە لێپرسراوی کتێبخانەی زانکۆ دوای گواستنەوەی زانکۆش بۆ هەولێر گەڕایەوە بەغداد وە لە زانکۆی بەغداد وانەی وتەوەو دواتریش خانەنشین کرا..

وە لە بەرهەمە چاپ کراوەکانی باڵدار:

١-ئەلف و بێی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی سەرەتایی.

٢-ئەلف و بێ بۆ گەورە (بۆ نەهێشتنی نەخوێندەواری).

٣-الاستعداد للقراءة و الکتابة (بە زمانی عەرەبی).

# ئیبراهیم ئەمین باڵدار

# 1920- 12/7/1998

لە ناو ئەم گەلەدا، ئەم شارەدا، مرۆڤ و کەسایەتی ناودار زۆرن هەریەکە بە پلەی باڵای خۆی ڕاژەی بەربلاوی وەك مانگی چواردە خەرمانەی داوە، یەکێك لەوانە مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدارە کە لەساڵی ١٩٢٠ لە گەڕەکی سابونکەرانی شاری سلێمانی لەدایکبووە. قۆناغی سەرەتایی لە قوتابخانەی فەیسەڵییە خوێندنی تەواو کردووە، ئینجا ڕوویکردۆتە بەغدا لەساڵی ١٩٣٩ خانەی مامۆستایانی ریفی تەواوکردووە، لەساڵی ١٩٤٠ بووە بە مامۆستای قوتابخانەی (جاسەنە)، دوایی گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەکانی چوارتاو تەوێڵە و مەڵکەندی و عەبدولئیلاهو شوێنانیتر.

هەر لەو دەمانەوە خولیای ئەوەی لە مێشکدا بووە خزمەتێکی مەزن پێشکەش بە منداڵی کورد بکات. لەم ڕووەوە لە ١٩٤٨/١/٢ دەستیکردوە بە پرۆژەی دانانی ئەلف و بێی کوردی بنەڕەتی بۆ پۆلی یەکەمی سەرەتایی. بە بەپیرەوەچوونی ئەم کارەی لەلایەن خوالێخۆشبووان سەبری خەتات و حاجی سوعاد سەلیم کە لە خۆشنووسە ناسراوەکانی بەغدا بوون نووسین و وێنەی بۆ کێشرا بوو بەشێوەی کلێشەی ڕەش و سپی لەساڵی ١٩٥٠ چاپکراو دابەشکرا.

ساڵی ١٩٥٢ لە بەرنامەکانی خوێندندا لە وەزارەتی مەعاریفدا پەسەند کرا. لەساڵی ١٩٥٣ دا لە لایەن مامۆستای بەهرەمەند (بەدیع باباجان) بە شێوەی ڕەنگاوڕەنگ وێنەی بابەتەکانی بۆ کێشراو باڵدار خۆیشی دەستی پیادا هێنایەوە. تا لە چاپخانەی (نەجاح) لە بەغدا بەو شێوە جوانە لە چاپدراو وەکو مژدەیەك کەوتە بەردەستی قوتابییانی ئەو قوتابخانانەی کە لە کوردستاندا خوێندن تیایاندا بە زمانی کوردی بوو. ساڵی ١٩٥٥ مامۆستا ئەمین باڵداری خوالێخۆشبوو ئەلف و بێیەکی بە ڕێنووسی هاوچەرخ بۆ گەورەکانیش دانا.

کتێبی (ئەلف و بێی کوردی) لە کوردستاندا دەنگی دایەوە. ساڵی ١٩٥٦ لە لایەن (ترودی متلمان)ەوە وێنەکانی جارێکی تر بۆ کێشرایەوەو جێگیربوو. نەوە دوای نەوە لە شارو گوندی هەرێمی کوردستانەوە بەهۆی ئەم کتێبە نایابەوە چاویان کرایەوەو فێری خوێندنی کوردی بوون. زۆربەی نەوەکانی کورد قەرزاباری ئەم مرۆڤە هەڵکەوتووەن. کامەران موکری شاعیر گێڕایەوە وتی: لە شەستەکاندا لە بەغدا بووم لە دوکانێکدا باسی کۆششی مامۆستا باڵدار هاتە پێشەوە. بە ڕێکەوت (دکتۆر خەلدون کوڕی ئەو (ساطع الحصری)یە دانەری (القراءة الخلدونية)، لە دەمی باوکیەوە گێڕایەوە وتی:

(باوکم دەیوت منێك كە پشتیوانێکی زۆرم هەبوو بۆ کتێبەکەم تا ناوبانگی پەیدا کرد، بگرە هێشتا (ئەلف و بێ ی) کوردییەکەی ئەمین باڵدار پێشکەوتووترە، گەرچی دانەرەکەی ڕۆڵەی گەلێکی چەوساوەو بێ پشتیوانە). مامۆستا ئیبراهیم باڵدار لە مامۆستاییەوە چووە کۆلێژی بازرگانی و ئابووری لە دواییدا چوو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پاش دوو ساڵ بڕوانامەی ماستەری لە بواری پەروەردەو دەروونزانیدا وەرگرت. کە گەڕایەوە بوو بە بەڕێوەبەری بەرنامەو کتێب لە وەزارتی پەروەردەی عێراقیدا. هەر لەو ساڵەدا خوشکە ئافتاو حەوێزی بوو بە هاوسەری (جوامێرو جوانڕۆو نازدار) بوون بە چرای ئەو خێزانە. دواتر لە زانکۆی سلێمانی و زانکۆی

سەلاحەدین وانەی زمانەوانی وتۆتەوە. جار جاریش لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بابەتی لە بارەی زمانی کوردیەوە نووسیوە. ساڵی ١٩٨٣ کتێبێکی لەژێر ناوی (الاستعداد للقراءة والکتابة)ی بە چاپگەیاند. ئەم ڕۆڵە ناسراوەی کە ناوی بەسەر زمانی هەموو خوێندەوارێکی کوردەوەیە، بە داخێکی زۆرەوە لە ١٩٩٨/٧/١٢ چاوەکانی بۆ هەمیشە لێکناو یەکێك لە ئەستێرە بەئەمەکەکانمان خامۆش بوو.

تەرمە پیرۆزەکەی بەرێزەوە لە گردی سەیوان بەخاکسپێردرا. ئەم گەورە پیاوە شایانی ئەوەیە پەیکەری بۆ دروستبکرێ. شوێن و جێگەی ڕووناکبیریی بەناوەوە ناوبنرێو ساڵانە یادبکرێتەوە.

سەرچاوە: بۆ نووسینی ئەم بابەتە کەڵك لە چەند گۆڤارو ڕۆژنامەو بەرهەمەکانی ناوبراو وەرگیراوە.

## لەیادی پێنج ساڵەی
## کۆچی دوایی (باڵدار)ی ئەمردا

زۆرن ئەو مرۆڤانەی بۆ خۆیان دەژین.. کە مردیشن کەس باسیان ناکات، دەچنە گۆشەی بیرچوونەوە، زۆر دەگمەنن ئەو مرۆڤە خۆنەویستانەی چنار ئاسا باڵادەکەن و بیر لەدوا ڕۆژی گەل و نەتەوەی خۆیان دەکەنەوە.

ئەدیب و شاعیر و خاوەن بڕوانامەی "ماستەر" لە پەروەردە و دەروونزانی منداڵدا (مامۆستا ئەمین باڵدار) لە ساڵی (١٩٢٠) لە گەڕەکی سابونکەران لە شاری سلێمانی چاوی بە ژیان هەڵهێناوە. لە قوتابخانەی (فەیسەڵیە) پۆلی شەشەمی سەرەتایی تەواو کردووە، بۆ تەواو کردنی خوێندن چووە شاری بەغدا (خانەی مامۆستایانی دێهاتی) ساڵی (١٩٣٩-١٩٤٠) تەواو کرد، لە قوتابخانەکانی (قەمچوغە، تەوێڵە، چوارتا، عەبدلالە، گۆیژە) وانەی وتۆتەوە، هەر کەبووەتە مامۆستا خولیای دانانی (ئەلف و بێ)یەکی نوێ لەسەر شێوازێکی پەروەردەیی کە لەگەڵ خواست و ئارەزووی منداڵاندا بگونجێت هیواو ئامانجی بووە، پاش وردبوونەوە لە کتێبی ئەلف و بێی (ئەحمەد عەزیز ئاغا) و (حامد فەرەج) و (ئەبو خلدون)، توانی (ئەلف و بێی نوێ) دابنێت لە ساڵی (١٩٤٨-١٩٤٩)دا. لەو کاتەدا خوالێخۆشبوو (م. عەبد حەمید حەسەن) کە پیاوێکی موسڵی کورد پەروەر بوو بەڕێوەبەری (معاریف)ی سینی بوو بەم کارەی زانی پاداشتی کرد. ساڵی (١٩٥٣) پاش هەندێك دەستکاری و گۆڕانکاری و ڕەچاوکردنی تێبینی بۆ جاری دووەم چاپکرایەوە، بەناوی (ئەلف و بێی نوێ) بۆ منداڵان، ساڵی (١٩٥٥) ئەلف و بێیەکی بۆ گەورەکان دانا.

لەساڵی (١٩٥٦) کتێبی (ئەلف و بێی نوێ) بەشێوەی ڕەنگاوڕەنگ لەلایەن ژنە بیانی (ثرودی میثلمان) بۆکرا لە چاپخانەی (رابطة) چاپکراو چەند داهێنانێکی لە پیت و وشەو ڕستە و شێوازی ڕێگەی دەنگی تیا پیادەکرد.

باڵدار بۆ خوێندنی باڵا چووە (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) لە پاش دوو ساڵ بڕوانامەی (ماستەر)ی وەرگرت لە پەروەردەو دەروونزانیدا، ساڵی (١٩٦٠) کۆشکی خێزانداری لەگەڵ (ئافتاو حەوێن) پێکەوەنا، کە زانکۆی سلێمانی کرایەوە بووە (مامۆستا) و لێپرسراوی (کتێبخانە)ی زانکۆ، بۆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانە سەردانی چەند وڵاتێکی عەرەبی و بیانی کردووە.

چەند لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکی لەسەر بابەتە پەروەردەییەکان لە ڕێگەی (گۆڤاری زانکۆ)وە بڵاوکردۆتەوە.

کتێبی (الاستعداد للقراءة والکتابة)ی ساڵی (١٩٨٣) بەچاپگەیاند، کە لێکۆڵینەوەیەکە لە وڵاتی (سعودیە، سوریا، میسر، ئەمریکا و ئەڵمانیا و هۆڵەندا و پۆلۆنیا) ئەنجامیداوە. کە (چۆن منداڵ پەروەردە و ئامادەبکەین بەشێوەیەکی سەرکەوتوو و گەشەدارو زانستی بۆ خوێندنەوە و نووسین) کە بە زمانی عەرەبییە.

دوای گواستنەوەی زانکۆش بۆ شاری هەولێر، گەڕایەوە شاری بەغدا و لە زانکۆی بەغداد وانەی وتۆتەوە.

لە ڕۆژی (١٩٩٨/٧/١٢) دڵە مەزنە پڕ لە هیواکەی لە لێدان کەوت. لە سەر داوای خۆی لە شاری بەغداد هێنرایەوە شاری سلێمانی لە گردی سەیوان ئارامگەی ئەدیب و نووسەر و کەڵە پیاوانی کورد پەروەر ئارامی گرت (جوانڕۆ و نازدار و جوامێر)ی پاش خۆی بەجێهێشت. لەساڵی(٢٠٠٢) دا قوتابخانەی (ئاوات) ناوەکەی گۆڕدراو کرایە قوتابخانەی (ئیبراهیم ئەمین باڵداری سەرەتایی تێکەڵ).

لە کۆتاییدا هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی ئەو مرۆڤەخۆنەویستە کورد پەروەرە.

# ئیبراهیم ئەمین باڵدار مامۆستایەکی گومناو

جەبار سابیر

سالی (١٩٨١)بوو بۆ یەکەم جار مامۆستام لەبەرامبەر خۆمدا بینیو یەکەم وانەش کوردی بوو کەخوێندمان، زۆرباش وردەکارییەکانم بیرنایەتەوە، بەلام ئەوەندەم دێتەبیر وشەی (دار)م زۆر بەسادەیی وەرگرت، کەیەکەم وانەی زمانی کوردییەو نیوسەدە زیاترە هەزاران دوکتۆرو ئەندازیارو یاساناسو زمانزانی پێپێگەیاندووەو بەردەوامیشە، ئەوکات زۆر لامسەرلاییانە لەکتێبی (ئەلف بێی نوێ)ی (ئیبراهیم ئەمین باڵدار)م دەڕوانی، ئەوە هەرمنیش نەبووم هەموو کەسێك بەو قۆناغەدا ڕۆییوەو دەڕوات، بەلام بەتێپەڕبوونی ڕۆژگارو بڕینی قۆناغەکانی تری خوێندن ئەو هەستە بێدەربەستەم نەماو گەورەیی ئەو پیاوەم بۆ دەرکەوت، ئەوەندەی ئاگاداربم یەکەمین ئەلف بێی کوردی لەنیوەی دووەمی بیستەکانی سەدەی پێشوودا لەلایەن (ئەحمەد عەزیز)و دواتر لەسییەکانیشدا (حامد فرج) ئەلف بێیەکی تری بەشێوازێکی تازەتر داناوەو بۆدواجاریش (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) لەسەرەتای پەنجاکاندا ئەم ئەلف بێیەی ئێستای داناوە کەئەوە چەند ساڵێکە لەکوردستاندا قسە لەسەر کۆنبوونو بەسەرچوونی دەکرێت.

کارەکەی باڵدار لەکاتێکدا کراوە کەبیری ناسیونالیستی کوردی جارێکیتر بەهۆی کۆماری کوردستان لەمهابادەوە لەناو کورددا سەری هەڵداوەتەوەو زیاتریش بایەخ بەبواری فەرهەنگو ڕۆشنبیری دەدات. باڵدار وشیارانە کاری کردووەو هەستی بەوە کردووە کەکۆمەڵگەی کوردی دەبێت قۆناغی کشتوکاڵیو گوندنشینی بەجێبێڵێو بڕواتە قۆناغی پیشەسازی بوونو شارستانییەتەوە بۆیە بەدرێژایی ئەو هەموو وانەیەی ئەلف بێی نوێ تاقە یەك وانەی تێدایە باس لەگوند



بکات ئەویش لەسەر زاری منالێکەوە کەدەڵێت گوندەکەمان واتا پێدەچێت ئەو منالە مەبەستی بێت کەماڵی باوکی پێشتر لەگوندەوە هاتوون. جگەلەوەش لەم کتێبەدا پەیوەندییەکان پەیوەندی سەردەمی سەرمایەداریو شارنشینینو بەدرێژایی وانەکان هەمیشە کوڕو کچ پێکەوەنو هاتووچۆی ماڵی یەکتر دەکەنو هیچ جۆرە جیاوازییەکی ڕەگەزی بەدی ناکرێت. نوسەر هەستی بەوەش کردووە کە خوێندن لەناو کورددا نوێیەو پێشتر تەنیا لەگۆشەی حوجرەی مزگەوتەکاندا خوێندن هەبووە ئەویش تەنیا بۆ کوڕ بووەو باڵدار هەوڵیداوە ئەو ڕەوتە بشکێنێو کچیش ڕاکێشێتە پۆلەکانی خوێندنەوەو لەڕێگەی وانەکانیشەوە کار بۆ سڕینەوەی شوێنەواری کۆنەپەرستی قۆناغی فیوداڵی بکات، بەوەی کچو کوڕ تێکەڵکاتو لەوانەکانیشدا هەمیشە جەخت لەسەر ئەو پەیوەندییە دروستەی نێوان کوڕو کچ دەکاتەوە بەوەی کەئەم دووە وەك

چـۆن لەماڵــەوە جیاوازییـــەکیان نییـــە هـــەروایش دەکـــرێ لەدەریشەوە جیاوازییەکانیان کارێك بۆ دابڕانیان نەکات.

ئەم هەوڵە نوێخوازانەیەشی بۆ ئەوەبووە کە ژیانی خەڵکی گونــدیش بگەیەنێتــە ئاســتی ژیــانی خــەڵکی شــارەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان گۆڕانی بەسەردا بێت و کاتێك کەچوونە شارەکانەوە هەست بەجیاوازی نێوان دوو ڕەگەزەکە نەکەن. هەمیشە لەوانەکانی ئەلفی بێی نوێدا یان خوشك و برایـەك هـەن یـان دوو هـاوڕێی کچ و کـوڕ، سـەرباری ئـەوەش بایــەخی بەلایــەنێکی تــری پەیوەندییــەکانی ئــەو دووە داوە، ئــەویش مەســەلەی بــەکارهێنانی زمانــە لەلایــەن کـوڕو کـچەوە لەئەلف بێکەدا. ئەو وشانەی بـەکاری دەبـەن وشـەی ئاسك و مۆسیقین. لایــەنی پــەروەردەیش لای باڵــدار پــشت گــوێ نـەخراوەو ئەوەنـدەی بۆیکرابێت لەتـەواوی وانەکانـدا ئـەدەبی قسەکردن و هەڵسوکەوتکردنی بیری منداڵ خستۆتەوە، بەتایبەت لەبەرامبــەر گەورەکانــدا وەك دایــك و بــاوك و هــەوڵی داوە دامەزراوەی خێزان لای منداڵ خۆشەویست بکات. ئەوەی ڕچاو کـردووە کە هـەرگیز وشەیەك بەکار نەبات کە ناشیرین یاخود وەك جنێو بەکاربێت. ئەمەیشی بۆ ئەوە کردووە کە سنورێك لــەنێوان ژیــانی منــاڵ لــەدەرەوەی مــاڵ و ژیــانی منــاڵ لــەناو قوتابخانەکاندا دابنێت. چونکە هەمیشە منداڵ لەدەرەوەی ماڵ واتا لـەکۆڵان جنێو فێردەبێت و لەقوتابخانەش ئەو جنێوانـەی بیردەچێتەوەو وشەی شیرین فێردەبێت.

باڵــدار کەســێکی وشــیارو هاوکــات ڕووناکبیرو شــاعیرێکی بەتواناش بووە ئەمەش کاتێك زیاتر ڕوندەبێتەوە کە وانەکان دەخوێنینــەوە، شـیعرییەت بەســەر تــەواوی وانەکانــدا زاڵــەو ئەوەندەی بۆی کرابێت کێش و سەروای بۆ ئەو چیرۆکانە داناوە کەوەك وانە بۆ منداڵی داناون، ئەمەش لەو هەستەوە هاتووە کە بــوونی ئــەو جــۆرە کــێش و ســەرواو مۆزیکــە لەوانەکانــدا هارمۆنیایــەك دروســتدەکات و وادەکـات منـداڵ زیـاتر ئەزبــەری بکــەن و حــەز بەخوێندنــەوەی بکــەن، چــونکە لــەڕووی دەروون ناسـییەوە منــداڵ حــەزی بەخوێندنــەوەی بابەتێکــە مانــدووی نەکات و خۆش دەست بێت، بەتایبـەت باڵدار وایکردووە وشەو ڕستەکانیش هەم کورت بن و هەم هەمان ئەو وشانەبن منداڵ لەو تەمەنە کەمەدا فێری دەبێت و بەکاری دێنێ و جۆرێك لەئەدەب و ڕێزگرتنیشی تێدایە کەڕەنگە ئێستاش لەمێشکی هەندێکماندا بزرینگێتــەوە. باڵــدار تــەواوی ئــەو یارییانــەی لــەم کتێبــەدا کۆکردۆتـەوە کەمنداڵ لـەو تەمەنـەدا خۆی پێوە سەرقاڵدەکات و ئـەو یارییانـەش زەرەرێـك لەجەسـتەی منـداڵ نـادەن، واتـا ئـەو یارییانە کراوەتە وانە کەمنداڵ دەتوانێ لەبەردەرگای خۆیان یان هەر لەناو ماڵدا بیانکات، یاخود باسی لەو خواردنانە کردووە کە تایبەتن بەکوردو لەمێژەوە لەلایەن خەڵکەوە دروستدەکرێن. پاشـان میـوەو سـەوزەو شـەربەت و دۆو مێـوژو نـانی سـاج و باسوق و سجوق و زۆر شتیتریش بەمەبەست بەکار هاتون و بۆ ئەوەیە منداڵ بزانێت لەکۆمەڵگەی کوردیدا ئەو شتانە هەبوون و هەن.

بـەڵام لەهــەمووی گــرنگتر لــەم کتـێبی ئـەلف بێـی نوێیــەی باڵداردا ئەوەیە کە وەك شاعیرو چیرۆکنوسێکی لێهاتوو ڕۆڵی داوەتە منداڵ و خوێنەرو خۆی لەتەواوی کتێبەکەدا ڕۆڵی نییە، خوێنەر بەتایبەت منداڵ کاتێکی ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە هەست بەوە دەکات کـە خـۆی لـەواقعی چیرۆکەکاندایەو کەسێك نییە بەناوی ئیبراهیم ئەمین باڵدار. دروستتر بڵێین باڵدار وایکردووە منـداڵ هەسـت بـەخۆی بکـات، نـەك هەسـت بـەبوونی مامۆسـتا لەوانەکاندا. ئەمـە بـۆ هـەردوو ڕەگـەزی نێـرو مـێ یاخود کـوڕو کـچیش هەروایـەو هـەرگیز هەسـت ناکرێـت پیاوێك لەوانەکانـدا ئامادەیی هەیـەو وەعـزی منداڵ دادەدات. بەبۆچوونی مـن ڕازی مانــەوەی وانــەکانی ئــەلف بێــی نــوێی باڵــدار لــەیادەوەری نەوەکان و بەدرێژایی نیو سەدە زیاتر بۆئەو خاڵە دەگەڕێتەوە کەباڵدار خۆی لەتەواوی وانەکاندا ئامادەیی نییەو ڕۆڵی داوە تە خودی ئەو منداڵەی کەوانەکە دەخوێنێتەوە. ئەمـەش خاڵی سەرەکی و بنەمایی سەرکەوتنی هەر بابەتێکی منداڵانە.

لەکۆتاییدا ئـەوەی مـاوە قسەی لەسـەر بکرێـت ئـەو وێنانەیـە لەگەڵ هەر وانەیەکدا کێشراوەو ئامادەیی هەیەو بـەڕەنگی زۆر گــەش و جــوان کــاری تێــداکراوە، تــا ئــەمڕۆش کــەس وێنەکێشەکەی ناناسـێت کەپێموایـە ئـەو وێنەکێـشە عەرەبـە، وێنــەکان بــەجۆرێك کاریــان لەســەر کــراوە گوزارشــت لــەخودی وانــەکان دەکــەن و ڕەنگــەکانیش لــەئارەزوی منداڵــەوە نــزیکن. بەتایبــەت بایــەخی بەجلوبــەرگ داوە کەتــەواو لەگــەڵ وانەکانـدا دەگونجێن و بۆ ڕاگرتنی هاوسـەنگی نێوان ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و شێوە ژیان و جلوبەرگ پۆشینی خەڵکی کورد ئەو جلوبەرگــە ســادەو ســاکارە وەك دەڵــێن ســفور یــان ئەفــەنی و مۆدەیــەی بــەکار هێنــاوە کــە ســەردەمییانەیەو نابێتــە هــۆی ناسینەوەی ئینسان، ئەم لایەنەش بۆ ئەوە دەگەڕێتە کەخودی باڵــدار کەســێکی مرۆڤدۆســتبووە نــەك ڕەگەزپەرست، چــونکە لەوانەکانیــشدا شــتێکی لەبابــەتی ڕەگەزپەرســتی بەرچــاو ناکەوێت.

# وێنەی چەند لاپەڕەیەکی کتێبی ئەلفو بێی نوێ بە ڕێنووسی لاتینی

## Elfúbéy Niwé

Bo púlí yekemí seretayí



Nigar: Trúdi Mítlman

*Dubare núsin be piti yekgirtúy Kurdi ú tébini. le Dilan Roshani*

«« Wéne u Wazi

| | | |
|---|---|---|
| A a | Aw | |
| B b | Ba | |
| C c | Caw | |
| D d | Dar | |
| E e | Des | |
| É é | Wéne | |
| F f | Fil | |



*Simore*

Simore kilkí zerd e
Cawí jiwan u bégerd e
Giwéy qute, pishtí bor e
Wiryaye, féllí zor e
Etwané ésqan bibirré
Ey simorey darewan
Giwéz zor xoshe bo zistan
Hi zil zil bisharewe
Bixe koní darewe

*le Fereydú Eli Emin*

| | | |
|---|---|---|
| G g | Ga | |
| H h | Hermé | |
| i | Dill | |
| Í í | Masí | |
| J j | Júјig | |
| Jh jh | Jhújhú | |
| K k | Ker | |



*Dar derrwénim*

Daye, daye!
Wa dú dar derrwénim.
Were Nazdar, wa derrwén.
Wa dém daye, dém.
Em dare derrwénim. Diway ewe dém.

M
m



*Daw*

Wí, Wí, daw.
Dawí Dara, daw.

W
w

# نمونەی چەند شیعرێکی باڵدار، بۆ منداڵانی نوسیوە

## پەپوولە

پەپوولەی جوانو ڕازاو،
ئێسك سووکی باڵ نەخشاو،
تۆ، کەی هاتی بۆ لامان؟
بەخێر هاتی سەر چاومان.
چاوەڕێت بووین زۆر بە کوڵ،
بیرمان دەکردیت بەدڵ،
لێرە زۆرە دارو گوڵ،
بفرە لەم چڵ بۆ ئەو چڵ

## باڵدار

پشیلەکەم
پشە خرپنەی چاوکاڵ،
خۆشەویستەکەی ناوماڵ،
ئەندام تووکنی خاڵ خاڵ،
سمێڵ درێژی لووت ئاڵ،
بەخێر هاتی، سەرچاومان،
جێگات چۆڵ بوو لە ناومان،
تۆ لە گوێ‌بووی، پشەی جوان؟
بۆچی خۆت وون کرد لێمان؟
باڵدار



مامۆستا ئبراهیم / مامۆستا توفیق / 1960 ئەمریکا



مامۆستا ئیبراهیم لەگەڵ هاوڕێکانیدا/ سلێمانی



نازداری کچی





جوامێری کوڕی

